حکومەتا هەرێما کوردستانێ - عیراق

وەزارەتا پەروەردێ

ڕێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# مافێن مرۆڤـــی

## بۆ پۆلا دەهێ ئامادەیی و پیشەیی


**ئامادەکرن**

حەمە ساڵح حەمە ئەمین    چێنەر عەلـی جۆلاّ

د. سالاّر حمە سور باسیرە    وشیار مستەفا خالّ

**هاتییە کرمانجیکرن ژ لایێ**

قیس صبـــاح حميـــد    كروان مصطفى مصطفى    سفـر اسماعيل عبدالله

فواز عبدالقهار عبدالله    كــاظــم سلمــان عبـدالله    إبراهيـم خالـد محمود

**پێداچوونا زمانی**

محمـد عبدالله أحمد

**پێداچوونا زانستی**

لشكر حاجي محمد طاهر



چاپا چوارێ    ٢٧١٥ کوردی    ٢٠١٥ زایینی    ١٤٣٦ مشەختی

**سەرپەرشتیێ زانستی یێ چاپێ:** قیس صباح حمید

**سەرپەرشتیێ هونەری یێ چاپێ:** عثمان پیرداود کواز - سعد محمد شریف صالح

**تایپکرن:** سعد محمد شریف صالح

**دیزاین:** عدنان أحمد خالد

**بەرگ:** زاگرۆس محمود عرب

**جێبەجێکرنا بژارەکرنا هونەری:** عدنان أحمد خالد

# تەوەرێ ئێكێ

## كورتيەكا ديرۆكى:

ل پەيدابوونا جڤاكێ مرۆڤاتييێ ودەركەفتنا تێگەهێن ملكدارييێ وبەروژەوەندى ودەستهەلاتێ، هەڤركى. وشەروپێكدادانان دەستپێكر و دوو جەنگێن شەڕێن جيهانى ژى لێ پەيدابوون، وان هەردو جەنگان كارەساتێن مەزن يێن وەسا ژێ پەيدابوون كو ب مليۆنان كەسان گيانێ خۆ ژ دەستدا هەرزى ئاقل دارێن جيهانێ هەست ب وان پێشێلكارييێن مەزن كرن كو دژى مرۆڤى ومرۆڤاتييێ دهاتنەكرن ودهێنەكرن، ب تايبەت د دەمێ شەر ونە ئارامييان دا، لەورا پێكولا دانانا سێستەمەكێ وەسا كر كو راددەكى بۆ وان پێشێلكاريان ب دانن..... ب وان ئەگەران هزر ل دانانا چەند بنەمايەكان كر هەتا مافێ تاكەكەسى وخەلكێ سڤيل وێين شەرنەكەر بهێتە پاراستن وسوزا پێگيرى بوونا دەستهەلات داران ژى ب وان بنەمايێن سەرەكى وەربگرن.

سالا (١٢١٥)، خەلكێ ئينگلتەرا بەلگەنامەك ب فەرمانرەوايێن خودا بوو موهركرن كو چەند مافەكێن مرۆڤى تێدا دياركربوون، ئەو پەيماننامە ب (ماگناكارتا)[1] ئانكو (پەيمانا مەزن) يا بەرنياس بوو.

دچەرخێ (رێنيسانسى) ژى دا، ل ئەورۆپا كومەكا زەلامێن زانا وهونەرمەند وهەژى پەيدابوون، هزرەكا وەسا يا گرنگ دارشت كو سەرجەم مرۆڤايەتى هژاند ورۆلەكێ مەزن درێخۆشكرن وگەشەپێدان وچەسپاندنا مافێ مرۆڤى ژى دا ديت.

---

(١) سالا (١٢١٥) دەسهەلاتا پاشايەتى ل ئينگلتەرا زور لاوازبوو ب تايبەتى پشتى پشكداريكرنا ئينگلتەرا دشەرێ خاچ پەرستان دا وتێكشكاندنا كەنيسا كاسۆليكى ئەڤ كارە بوويە ئەگەرێ نەرازيبوونێ دناڤبەرا خانەدانان وسويارچاكاندا، ژلايەكێ ديترڤە ئاكنجييێن باژێران دژى دەسهەلاتا پاشاى رابوون ونەچاركرپەيماننامەكێ دگەل ئيمزا بكەن ب ناڤێ (ماگناكارتا = پەيمانا مەزن)، ئەو پەيمان ژ (٦٣) بەندان پێكهات بوو، ژوان بەندان: رێكخستنا باجێ زيندان نەكرنا چ كەسان بەرى كو ياسا رێكێ بدەت دەستێوەرنە دان دكاروبارێن دادگەهان دا هەردەمێ پاشايێ پێگيرنەبيت ب وێ ياسايێ بۆ خانەدانان ودەرەبەگان هەيە دژى وى ب راوەستن.

سالا (١٦٤٢)، (لۆلیڤەر کرومیل)[1] سەرکردایەتیا شۆرەشەکا بورجوازی یا دیموکراتی ل ئینگلتەرا دکر وپاشا (شارلێ ئێکێ) ژناڤبر وپەرلەمانەك پێك ئینا، وی پەرلەمانی د سالا (١٦٨٩) دا چەند بنەمایەکێن وەسادارشتن کو ئارمانجا وی کێمکرنا دەسهەلاتا پاشاتییێ وپشتەڤانیکرنا ئازادیێن کەساتی بوو، هەر دوی سەردەمی دا فەیلەسوفەکێ مەزن ب ناڤێ (جۆن لۆك) پەیدابوو، بوچوون ونڤیسینێن خۆ دسێ خالان دا کۆ مکرینە:

١-یاساییێن سروشتی، بێ جودا هیا رەگەز، ئایین.... هتد، درێکا هش وبیران ڤە، ب رێکا ئەزموونان وهەستێن مە دهێتە نیاسین.

٢-دانانا بەنداتییێ (بەنیاتی) ب کارەکێ نەرەوا.

٣-هەمی کەس بۆ پاراستنا ژیان و ئازادییێ د ماف و ئەرکان دا وەك هەڤن.

ڕاگەهاندنا سەربەخۆیا ئەمریکا، ل (٤) ێ تیرمەها (١٧٧٦ز) دا، بۆ ئێکەمین جارداکوکی ل راستیەکێ دهێتە کرن کو مرۆڤ ژ دایکبوونا وان ڤە دیەکسانن وخودایێ مەزن هندەك مافێن بنەجه پێ داینە، وەك مافێ ژیانێ، وئازادیێ، وگەریان ل دویف بەختەوەرییێ، حکوومەت ژی ژپێخەمەت د دەستڤەئینانا ڤان مافان دا هاتینە دروستکرن.سێزدە ویلایەتێن ژ ویلایەتێن ئێکگرتییێن ئەمریکی دەستوورێ بنەرتێ خۆ گوهۆری وهەشتێن دی ژی ئەو راگەهاندنا مافێ مرۆڤی دئێخستنە سەر دەستوورێ دەڤەرێن خۆ، هەمیان مافێن تاکەکەسی ب گرنگی (داناى نە) و دبێژن ئەڤە ئازادیێن سەرەتاییێن مەدەنینە (سڤیل).

---

(١) سیاسەتمەدارەکێ ئینگلیزی و ئەندام پەرلەمان بوو وسەرکردایەتیا بزاڤەکا بەرهنگارییێ دکر دژی پاشای، ل سالا (١٦٤٢) شەرێ نافخۆیێ ئینگلتەرا دناڤبەرا پشتەڤانێن پاشای ولایەنگرێن پەرلەمانی دەستپێکر و ل سالا (١٦٤٥) ب سەرۆکاتیا (لۆلیڤەرکرومیل) سەرکەفتنەکا مەزن ب دەستڤەئینا.

شۆرەشا فرەنسا ل تیرمەها (١٧٨٩) سەرهلدابوو. د مەها تەباخا هەمان سال دا جڤاتا گەل (پەرلەمان) هاتە دامەزراندن. ئەڤێ جڤاتێ مفا ژهەردو نموونێن بریتانیا و ئەمریکا د بیاڤێ مافێ مرۆڤی دا وەرگرت، ژبلی هندێ مفایەکێ زور ژی ژ (بەر هەمێن) هەر سێ هزرمەندێن فرەنسی (جان جاك رۆسۆ [1]، ڤولتێر [2]، مونتسکیۆ [3]) وەرگرت. ئەڤێ جڤاتێ مافێ مرۆڤی وهەڤوە لاتیبوونێ ب (١٧) بەندان ڕاگەهاند د سالا (١٧٩١) ژی دا ئێخستی یە دناڤ دەستووری فرەنسادا.

ڕێکەفتننا (لاهای) سالا (١٨٩٩)، ئەو ڕاگەهاندن و ڕێکەفتنامە ب خۆڤا گرتن کو پێدڤی یە د دەمێ شەڕان دا بهێنە پەیرەوکرن، ژوانا ڕیکەفتننا لاهای (١٨٨٩) وریکەفتننا (١٩٠٧) یاتایبەت ب ب دەمێ شەڕانڤە، ژ شێوازێن ڕێکخستنا خەلکی وب کارنەئینانا چەکێن کومکوژ وقەدەغەکرنا وان وچەوانیا سەرەدەریا شەرەکەران وپاراستنا گیانێ هەڤوەلاتیێن سڤیل ودەزگەهێن مەدەنی.

ئەو ڕێکەفتننامە گرێدایە ب پاراستنا مافێ مرۆڤی ڤە د دەمێ شەڕ وپێکدادانانداً، بەحسێ پاراستنا ئێخسیر وبریندارن دکەت، د سالا (١٩٠٧) دەستکاری د دەڤێ ڕێکەفتنامێ داکریە وگرنگیەکا زێدەتر ب بریندارێن شەڕان

---

(١) جان جاك رۆسۆ: (١٧١٢ — ١٧٧٨) نڤیسەرەکێ فرەنسی یە وپەرتووك دبیا ڤێن فەسەلفە وکۆمەلایەتی دانایە، تێدا بەحسێ چاکیا مرۆڤی کریە وداخازا ڤەگەریانێ بۆ سروشتی دکەت ژبەرهەمێن وی (پەیمانا کومالایەتی، ئەمیل، دانپێدان) بنەمایێن هزر وبیرێن وی کاریگەریا خۆ دشۆرەشا فرەنسی دا هەبوو.

(٢) ڤۆلتێر: (فرانسوا ماری ئەرواس) (١٦٩٤ — ١٧٧٨) ژدایك بوویێ پاریسە، نڤیسەرکێ بلیمەتێ فرەنیسی یە،سەرکردایەتیا بزاڤا فەلسەفا ماتریالی کریە وبەر هنگاری دەسهەلاتا ئایینی و مەدەنی بوویە ورەخنە لێ گرتی یە. شعر ومێژوو وشانۆ ونامە لێکگوهۆڕین وفەلسەفە نڤیسی یە.

(٣) مونتسکیۆ: (١٦٨٩ — ١٧٧٥) ژمەزنە هزرمەندێن فرەنسی یە پەرتووکا (گیانێ یاسایان) ژ مەزنترین بەرهەمێ وی یە کو تێدا داکوکی ل سەر جوداکرنا دەسهەلاتا (یاسادانان، جێبەجێکرن، دادوەری) کریە. مونتسکیۆ ژ پێخەمەت دابینکرنا ئازادی و دادوەریێ، داخازکر ب شێوازێ سیستەمێ ئینگلیزی یێ سەردەمی کو مونتسکیو ب باشترین جورێن حوکمی دزانی، پاشا وتەخا ئورستوکرات وتەخا گشتی هەڤپشکیا حوکمی بکەن.

و ئیخسیر وخەلكێ سڤیلێ وێ دا. ول دویف داژی سالا ١٩٤٩) ل جنیف ل سەر چوار خالێن گرنگ رێكەفتن، ئەوژی پاراستنا بریندارێن شەران، ئێخسیر، جهێن پیرۆز، جهێن مەدەنی.

پرۆتۆكۆلەك بۆ قەدەغەكرنا ب كارئینانا گازێن ژەهراوی وماددێن بەكتریۆلۆژی، كو ب ئامرازێ شەرێ درندانە ددانا، ل جنێف ئیمزاكر.

## ڕاهێنان

- د دەمێ هەردو شەڕێن جیهانی وشەر وپێكدانێن دی دا، مافێ تاكە كەسی وەكو پێدڤی دهاتە پاراستن؟
- كوشتن وكاڤلكاریێ هەر سڤیلەك ڤەدگرت؟
- بۆ راگرتنا كاڤلكاری وئەو نەرەوایێن دژی جهێن پێروزدكر، چ هاتیە كرن؟
- ژبلی دەولەتێن زیان ڤێكەفتی لایەنێ دیتر ل سەر نەرەوایەتیا شەڕی نەرازیبووینە؟

# تەوەرێ دووێ

## قۆناغێن پاراستنا مافێن مرۆڤی:

پاراستنا مافێ مرۆڤی، ل دویف پێشکەفتن و بەرەف پێشڤەجوونا جڤاکێ مرۆڤاتییێ، ئەڤ قۆناغە ب خۆڤە دیتینە: قۆناغا ڕەوشت و تیتالان، قۆناغا یاسایی، قۆناغا دەستووری، قۆناغا نیڤدەولەتی.

## قۆناغا ڕەوشت وتیتالان:

دشێن بێژین، مافێ مرۆڤی ب شێوێ رەوشت وتیتالان دناڤ جڤاکی داهە بوویە، ئەوژی ب ئەگەرێ نەبوونا یاسایا نڤیساکی. د بنەڕەت دا ژی تیتال ژ دوو بنەمایێن سەرەکی پێك دهێت:

**ئێك:** بنەمایێ ماددی، پێکهاتی یە ژدووبارەکرنا کریارەکێ یان نەکرنا کریارەکێ دبیاڤەکێ دیارکری دا.

**دوو:** بنەمایێ مەعنەوی، پیّکهاتیە ژ باوەرئینان ب کرن یان نەکرنا کارەکی کو پێگیری بوون پێڤە پێدڤی یە.

دکەڤن دا جڤاك ژ چەند خێزانەکان پێکهات بوو، لەورا کی ژ وانا خودان دەسهەلات وهێز بایە، فەرمانێن وی ژلایێ خەلکی ڤە جهێ یاسایا ئەڤرۆ دگرت. ڕویدانا هەرگرفتەکێ دجڤاکی دا ئاراستەی وی دکرونەوی ژی بریارا خۆ ل سەردا ئێدی کەسێ ژی بۆ وی نەبوو بەرهنگاریا بریارا وی بیت... د دویف دا ئەو خودان دەسهەلات بوو دهۆز وخێلێ دا، ناڤێ سەرۆك هۆز یان سەرۆك خێل لێ دانایە... پشتی چاندن پەیدابووی وب رێڤەبەرنا هۆکارێن بەرهەمئینانێ، زاڵ دەستان (متسلط) ل دویف تیتالان جڤاکێ خۆ ب رێڤەدبر وزێدەتر هزر ل بەروژەوەندییێن خۆدکر ژبەر ژەوەندیا خەلکێ دیتر. ژبەر ڤێ چەندێ جڤاکێ وی سەردەمی

د ئەنجام دا دوو چینێن سەرەکی تێدا سەرهلدان، ئەوژی چینا بەندان وچینا ئورستۆکراتی بوون، یائێکێ نزمترین و یا دووێ بلندترین چین بوو. دناڤبەرا ڤان دووچینان دا زێدە وکێم چینێن دیتر سەرهلداینە، ئەوان ژی ل دویف دویری ونێزیك یاوان ل دەسهەلاتێ هاتینە جوداکرن، وەکو کەسەکێ ب جەرگ وژێهاتی کو رێڤەبەرێ کارێن وان بیت یان ب رێیا ژن وژنخوازیێ پویتە پێدابیت.

ئانکو قۆناغا تیتالان قۆناغەکە تێدا ماف ب رێکا تیتالان ڤە دهاتنە پاراستن وهێشتا یاسایا نڤیسکی د وی دەمی دا نەبوو، بەلێ ئەڤەژی وێ ناگەهینیت کو پشتی پەیدابوونا یاسایا نڤیسکی تیتال ب تەمامی رۆلێ وێ نەمابیت، بگرە هەتا نهو ل هندەك جهان تیتالان رۆلێ خۆ یێ هەی د ڤی بیاڤی دا.

د ڤێ قۆناغێ دا، ئەگەر نەبێژین هەمی ماف دپێشێلکری نە، ئانکو کێمترین مافێ مرۆڤی تێدا دپاراستینە، چونکی بەردەوام ماف بۆ خودان هێزابوویە. هەر ب وی حوکمی چڤاك دوی دەمی دا چینایەتیەکا گەلەك ئاشکرا یاپێڤە دیار بوویە. بەند نزمترین وبێبارترین چین بوو، وئەوێن کو دئازاد بوون ژی سیفەتا هەڤوەلاتیبوونێ هەبایە چەند مافەك وان هەبووینە، وەك: مافێ ژیانێ، مافێ ملکداریێ، مافێ پێکئینانا خێزانێ، مافێ هەبوونا بەندان، بەلکو وەك تیتالەك دپاراستی ودپەیرەوکرینە، لەورا هەر پێشێلکرنەکا ڤان مافان گەلەك ب ساناهی وئاسایی بوویە. د دویف دا ژبەر پێشڤەچوونا مەدەنیەتێ و ب دروستبوونا دەولەتی وبەرفرەهبوونا چڤاکی وداهێنانا  تومارکرنێ، نڤیسین ب شێوەکێ سادە هاتە گۆرێ، پاشی یاسایێ سەرهلدا کو رەوشت وتیتال ب ئێك ژ ژێدەرێن وێ دهێنە هژمارتن.

## ڕاهێنان

- مەرەم ژ رەوشت وتیتالان چی یە؟
- ئەرێ ڕەوشت و تیتال ژێدەرەکە ژ ژێدەرێن یاسایێ دهێنە هژمارتن؟ دشێن نمونەکێ ژ وی لایی ڤە بزانین؟
- ئەرێ مرۆڤی هەر ژکەڤندا یاسایا نڤیسکی هەبوویە؟ ئەگەر نەبیت بۆچی؟
- ئەرێ جڤاکێن سەرەتایی ب چ شێوەکی ب رێڤەدچوون؟
- ئەرێ تیتال شیابوون ب شێوەکێ دادپەروەرانە مافێ مرۆڤی ب پارێزیت؟
- ب ڤی شێوەیی جڤاکێ وی سەردەمی چ جڤاکەك بوویە؟ مەرەم پێ ئەڤەیە (فرەچین بوویە یان چەوا؟)

## قوٚناغا یاسایی:

ب پێشڤەچوونا مەدەنیەتێ، و پێکهاتنا دەولەتێ، یاسا ژلایێ دەولەتێ ڤە هاتە دانان و ب یاسایێن نڤیسکی هاتنە نیاسین. دەستپێکێ دانانا یاسایێ ب تنێ ناڤ بوو، چونکی دەستکاری دتیتالێن کەڤندا نەدهاتەکرن ب تنێ دنڤیسان. وهوسا وەلێ هات کو ل دویڤ حوکمێن وی خەلکێ خوٚ پێڤەگرێدەن. یاسایا حامورابی ل عیراق ویاسایێن لوٚلونی ل یونانێ ویاسایا دوازدە تابلوٚیێن روٚمانیان نمونا وان جوٚرە یاسایانن. حامورابی کو نێزیکی دوو هزار سالان بەری زایینێ پاشایێ بابل بوویە، یاسایا وی ل سەر بەرەکی نەخشاندی یە وب یاسایەکا کەڤن دهێتە دانان. ئەو یاسا نڤیسینا تیتالێن بەر بەلاڤێن سەردەمێن خوٚبوویە وبەحسێ مەسەلێن: سزادان، (دەسکەفتێن، (امتیازات)) کاربەدەستان، گریبەستێن کرین وفروٚتنێ، ڤەگوهاستنا کەل وپەلان، وەکالەت، قەر، دەست بسەردا گرتن، مەسلا بەنداتییێ، وخێزانێ کریە.

دەرکەفتن وبجهئینانا یاسایێ پێنگاڤەکا گرنگ بوو ژروویێ دیارکرن وپشتەڤانیکرنا مافێ مروٚڤی، ئەگەر د دەستپێکێ دا ب شێوەکێ سادە ژی بیت بەلێ دگەشەکرنەکا بەردوام دابوویە هەتا گەهشتی یە وی ئاستێ کو نهو تێدا.

### ڕاهێنان

- ب پەیدابوونا نڤیسینێ وبەرفرەهبوون وگەشەکرنا جڤاکان دڤیا وان چ تشتەك بوٚ ڕێکخستنێ کربایە؟
- ئەوی پروٚگرامی چ ناڤ بوٚ دانا؟
- حامورابی کی بوویە؟ و چ کریە؟
- ئەرێ یاسایا حامورابی وئەو یاسایێن دیتر ژی کو دوان دەمان دا ئەڤێن ل دویڤڕا هاتین، مافێ مروٚڤی ب باشی دپاراست؟ ئەگەر نە بوٚچی؟

## قۆناغا دەستووری:

ژ پێخەمەت زێدەتر ڕێکخستنا پەیوەندیێن مرۆڤی وجڤاکی، یاسا پێشڤەچوو و دەستوور ژێ پەیدابوو، کو ب ژێدەرێ یاسایێ دهێنە هژمارتن د دولەتێ دا، و ژ کۆمەکا بنەماییێن یاسایی یێن گشتگیر پێکدهێت و جۆرێ سێستەمێ دەولەتێ دیاردکەت، بسپۆریا دەسهەلاتا (یاسادانان، ب جیهئینان، دادوەری) وسەربخۆ بوونا هەر ئێك ژوانا وجودا بوونا وان ژئێك دوو، ئازادیێن کەسی وئەرك ومافێن وانا دەستنیشان دکەت.

هەر جڤاکەکی دەولەت هەبیت، ئەڤجا قەبارێ وێ دەولەتی هەر چەندبیت، بۆ ڕێکخستنا پەیوەندیا پێدڤی ب رێیان ویاسان دبیت، هەر ئەڤەژی بوویە ئەگەرێ سەرهلدانا زانستێ دەستووری... پەیڤا دەستوور د بنەڕەت دا پەیڤەکا لاتینیە ب رامانا فەرمانا ئیمبراتورێن رۆما دهێت، دزمانێ ئینگلیزی وفرەنسی ژی دا دبێژنێ (Constitution). ود زمانێ کوردی دا دبێژنێ (دەستوور) وب چەند شێوەکان دهێتە پێناسەکرن.

ب ڤی ڕەنگی پەیوەندیەکا تەمام دناڤبەرا دەستووری و مافێ مرۆڤی دا هەیە، چونکی ژ لایەکی ڤە دەستوور ژێدەرێ یاسایانە و مافا دەستەبەردکەت ودپارێزیت و دکەتە مافێ دەستووری، ژ لایەکێ دی ژی ڤە دناڤ یاسایاندا دهێتە بنەجهکرن، کو ئەڤە وێ دگەهینیت پێشیلکرنا هەر ئێك ژ وان مافان، ئەگەر دەسهەلات ژی بیت پێشیلکرنەکا دەستووری دهێتە دانان. هەر د وی چارچوڤەیی ژی دا د پڕانیا وەلاتان دا مەرجەکێ دەستووری یێ وەسا دادنن هەتا د دەمێ گوهۆرین وچاکرنا بەندێن دەستووران دا ب هیچ شێوەکی دەستکاریا وان مافان ناهێتەکرن وژێ کێم ناکەن.

هەردهەمان بیاف دا، دوان وەلاتان دا دادگەهەکا بلند ب ناڤێ (دادگەها بلندا دەستوور) ی هەیە، ئەو دادگەهـ چاڤدێریا جێبەجێکرنا دەستووری وپاراستنا وان مافان دکەت کو تێدا هاتینە، ودەسهەلاتا هەلوشاندن وژناڤبرنا هەر یاسا ورێسایەك سەرە دەرییە ك ژی هەیە کو ب بەرۆڤاژیا وان بیت.

دەستوور خودانێ چەند گرنگییەکا یە، ژوانان:-

١- دانانا سنۆرەکی بۆ دەسهەلاتان (یاسادانان، ب جهئینان، دادوەری) و جوداکرنا وان ژ هەڤدو.

٢- دەستوور ژێدەرەکە بۆ سەرجەم یاسایان.

٣- دیارکرنا دەسهەلاتا هەر ئێك ژدە سهەلاتێن لسەری دیار.

٤- دەستوور زامنەکێ (مسۆگەرکرنەکا) یاساییە بۆ ئازادیێن گشتی ومافێن کەسان.

٥- دەستوور زامنێ (مسۆگەرکرنا) پشکداربوونا هەمی کومەلێن سیاسی دکەت د برێڤەبرنا دەولەتێدا.

ژبەر کو بەندێن دەستووری د دەولەتێدا، خودانێ پیرۆزی وگرنگیە کا مەزنن، پێدڤییە بجۆرەکی بهێنە دارشتن کۆ پرانیا مافان مسۆگەر بکەن وببیتە پالپشتەکێ مەزن بۆ چەسپاندنا وان، ئەوژی وەدکەت پشتڕاستی و ئارامی لدەڤ جڤاکی دروستبیت، وترسا کەسێن جڤاکی ژی ژ خوارنا مافێن وان ژلایێ دەسهەلاتێ ڤە نەمینیت.

## ڕاهێنان

- نهۆ هەر دەولەتەکێ یاسایەکا بنەڕەتیا خۆ هەیە، چ د بێژنە وێ یاسایا بنەڕەتی؟
- ئەو دەستوورێ کو دبیتە ستوینا بڕێڤەبرنا دەولەتێ، ب وان یاسایان ئەم دشێین چ بدەستڤە بینین؟
- هەمی دەولەت پەیرەوا دەستوورێ خۆ دکەن؟
- ئەو دەولەتا دەستوورێ خۆ پەیرەو دکەت وڕێزێ لێ بگریت، چ دەولەتەکە؟
- ئەرێ تۆ دبێژی دەستور دئێکەم جاردا ب وی جۆری بیت وەك بەحس ژێ هاتیەکرن؟ ئانکو دەستهەلاتداران پێگیری پێ دکر؟
- قۆناغا دەستووری و قۆناغا یاسایی کیژ وان ب پێشکەفتیتر دهێتە دانان؟ بۆچی؟
- دەستور ژ لایێ دەولەتێ ڤە بهێتە دانان باشە؟ یان ژ لایێ ئەندامێن هەلبژارتی ژلایێ گەلی ڤە؟
- گرنگترین ماف د دەستووری دا کیژە؟

## قۆناغا نیڤ دەولەتی:-

ئەگەر مافێ مرۆڤی د قۆناغا دەستووری دا جهێ خۆ د بەندێن دەستووری دا کربیت لێ د ڤێ قۆناغێدا ب ڕێکا چەندین پەیماننامە و ڕێککەفتنامێن نیڤ دەولەتیڤە مورکەکا نیڤ دەولەتی پیڤە هاتە دانان.

د ڤێ قۆناغێدا چەندین کومبوون و کونفرانس دناڤبەرا وەلاتاندا هاتنە گرێدان، هندەك ژوان بۆ چارەسەریا کێشە وگرفتێن وان هندەکێن د یژی بۆ جهگرتنا یاساییێن نیڤ دەولەتی و ئیمزاکرنا رێککەفتنامێن تایبەت ب مافێ مرۆڤی ڤە ژ وانا: ئیمزاکرنا پەیماننامەیەکێ بۆ نەهێلانا بەنداتییێ، نەهێلانا بازرگانیکرنا ب ماددێن بێهۆشکەر، کەمە تەپەسەران، رێککە فتناما تایبەت ب مافێن مەدنی و سیاسی، پاراستنا ملکداریا پیشەسازی وئەدەبی وهونەری، نەهێلانا جوداهیا ژنان... هتد. هەروەسا پشتی نەمانا کۆمەلا گەلان، رێکخراوا نەتەوێن ئێکگرتی ل سالا (١٩٤٥) وەك رێکخراوەکا نیڤ دەولەتی هاتە دامەزراندن، کو پسەرکەفتیانە شیایە هەتا ئاستەکێ باش گرنگییێ ب پرسێن مافێن مرۆڤی بدەت و ب ڕێکا کارکرنێ پرنسیپێن مافێ مرۆڤی بنەجهـ بکەت.

# تەوەرێ سێیێ

## نەتەوێن ئێکگرتی ومافێن مرۆڤی:

پشتی هەلبوونا چریسکا شەرێ جیهانیێ دووێ وشکەستنا کۆمەلا گەلان د پاراستنا ئاشتیا جیهانی و پێکئینانا پەیوەندییەکا ئاسایی ودویر ژ شەرێ دناڤبەرا دەولەتاندا، بۆ ئێکەم جار (فرانکلین د. روزفیلت)ێ سەرۆکێ ئەمریکا، ناڤێ نەتەوێن ئێکگرتی ئینا، دوێ ڕاگەهاندنێدا کو ٢٦ حکوومەتان تێدا سۆزدان بەردەوام بن د شەڕیدا هەمبەر هێزێن "تەوەری" ی (محور)ی.





کۆمەلا گشتی یا نەتەوێن ئێکگرتی

د دەمێ کونگرێ نەتەوێن ئێکگرتی ل (٢٥ — ٢٦ نیسانا ١٩٤٥) ێ ل سانفرانسیسکۆ هاتیە گرێدان (٥٠) دەولەتان پشکداری د دانانا بەلگەناما (میثاق)وێدا کر، ئەوژی لدویڤ وان پێشنیازێن نوینەرێن ئێکەتیا سۆڤیەت وچین و ویلایەتێن ئێکگرتییێن ئەمریکا، ل تەباخا (ئاب — ١٩٤٤) ێ کربوون. ل رۆژا (٢٦) خزیرانا (١٩٤٥) ێ، هەر (٥٠) دەولەت وپۆلۆندا، کو نوینەرێ خۆ د کۆنگرێ دامەزراندنێ دا دانابوو، ئیمزاکر، ب ڤی رەنگی بوونە (٥١) دەولەت...

قەبارێ نەتەوێن ئێکگرتی، ل رۆژا (٢٤)ێ چریا ئێکێ (١٩٤٥) ێ ب فەرمی هاتە نیاسین، ئەوژی پشتی کو هەر ئێك ژ ئێکەتیا سۆڤیەت وچین و فرەنسا وویلایەتێن ئێکگرتییێن ئەمریکا وبرانیا وەلاتێن دیژی ئیمزا یا خۆ لسەر کری.

دپێشگوتنا بەلگەناما وێدا کو ب دەستووریٚ نەتەوێن ئێکگرتی دهێته نیاسین هاتیە: "ئەم گەل ونەتەوێن ئێکگرتی سۆزێ ددەین بەرەبابێن (جیل) ێن داهاتی ژ شەرو وکارەساتان بپارێزین، دهەمان بیاڤێژیدا پەیمانێ نوی دکەینە ڤە و باوەریبوونامە ب ماف وب وێ کو زەلام وژن ونەتەوە ب مەزن وبچویکێن خۆڤە، مافێ وەکهەڤ و وەکی ئێك هەیە"

سالانە ژی ل (٢٤) ێ چریا ئێکی ، ب وێ هەلکەفتێ دهەمی جیهانێدا ئاهەنگ دهێنە سازکرن.. نهۆ هژمارا ئەندامێن نەتەوێن ئێکگرتی گەهشتییە (١٩١) دەولەتان.

ئەڤێ رێکخراوا نیڤ دەولەتی، دگەل چەندین ئارمانجێن خۆ، دوو ئارمانجێن سەرەکی هەنە:

١- ئاشتیەك لسەر بنیاتێ وەکهەڤیێ دناڤبەرا گەلان ومافێ چارەنڤیسێ وان دا دانیت.

٢- بێ جوداهیکرنا ڕەگەز، زمان، ئایین، رەنگ، یان نەتەوە، مافێ مرۆڤی بهێتە چەسپاندن.

نەتەوێن ئێکگرتی د (١٠/١٢/١٩٤٨) ێدا، جارناما جیهانیا مافێن مرۆڤی، د (٣٠) بەندان دا ڕاگەهاند، کو ئەڤ مافە بخۆڤە گرتبوون: (مافێ ژیانێ، سەربەستی، سلامەتیا کەسی، وەکهەڤی بەرامبەر یاسایێ،دویرکەفتن ژگرتنا بێ ئەگەر، دادگەهکرنا ئاشکرا، ئازادییا هاتن وچۆنێ، مافێ پەنابرنێ بۆ هەر وەلاتەکی، مافێ ڕەگەزنامێ، هەڤژینی، ملکداری، مافێ دەربڕینێ، پشکداربوون د ڕێڤەبرنا وەلاتیدا، ئازادییا دەنگدانێ وخۆ هەلبژاردنێ.

سالا (١٩٤٩) ێ ل باژێرێ (جنێف) ێ رێککەفتنامەکا تایبەت ب چاواتیا پاراستنا مافێن مرۆڤی د دەمێ شەراندا هاتە ئیمزاکرن کو گرنگترین خالێن وێ پێکهاتیبوون ژ: پارستنا "بریندارێن شەران، ئێخسیر، جهێن پیرۆز وجهێن

سڤیل (مدنی) " ئەڤ خالە پشتی دەستکاریکرنا ڕێککەفتناما (لاهای) یا سالا (١٨٩٩) هاتن، کو گرێدداینە ب پاراستنا مافێن مرۆڤی ڤە، لدەمێ شەر و شوران دا بەحسێ پاراستنا ئێخسیر وبریندااران دکەت.

د دویڤ دا ژی ل سالا (١٩٥٥ — ١٩٦٦)، ئەندامێن ڕێکخراوا نەتەوێن ئێکگرتی پێکگوهۆرینا هزر وبیران وڤەکۆلینێن تێرو بەرفرەهـ لدۆر مافێن مەدەنی وسیاسی و ڕەوشەنبیری و کۆمەلایەتی کرن، هەتا ل ١٩٦٦/١٢/١٦ ێ دوو ڕێککەفتنامێن جودا و پڕوتۆکولەکا ب حەز ورازیبوون هاتە راگەهاندن، ڕێککەفتناما ئێکی یا تایبەت ب مافێن مەدەنی وسیاسی و ژ (٥٣) بەندان پیکهاتیە، و (١٢٤) دەولەتان ئێمزا کریە و پێگیریا خۆژی پێڤە راگەهاندیە... ئەڤ ڕێککە فتنامە گازی وەلاتان دکەت بۆ دانانا ڕێ وشێوازێن گونجای ژ پێخەمەت پاراستنا وان کەمە نەتەوە وئایین ورەگەزێن، د چارچۆڤێ وەلاتێن واندا دژین. ب ڕێکا چەند بەندەکێن ڕێککەفتنامێ، نەتەوێن ئێکگرتی "کومیتا مافێن مرۆڤی" بۆ چاڤدێری و بجهئینانانا ڕێککەفتنامێ پێکئینایە و وەرگرتنا سکالایێن هەڤوەلاتیێن وان دەولەتێن کو ڕێککەفتنامە و پڕوتۆکولێن ب ئارەز ۆ ئیمزاکری، پێ سپاردییە.

ڕێککەفتناما دووێ، یاتایبەتە ب مافێن ئابووری وکۆمەلایاتی وڕەوشەنبیری ڤە، ژ دیباجەکێ و (٣٠) بەندان پێکهاتییە، کو بەحس ژ (مافێ کارکرنێ وئاستێ باش ژیاریێ، دادوەری د دەستکەفتنا کاریدا، مافێ خێزان وزارۆکان دبیاڤێن پاراستن وپەروەردە وفێرکرنێدا... هتد دکەت.

نەتەوێن ئێکگرتی دەستەبەرکرن، وبجهئینانا مافێن مرۆڤی وئازادیێن بنەرەتیێن وی، وەك ئارمانجەکا سەرەکی دیارکرینە. وەلاتان ب دەستەبەرکرن و پاراستنا وانڤە پێگیر دکەت.

نەتەوێن ئێکگرتی چەندین دەزگایێن تایبەتی بۆ برێڤەبرنا کاروبارێن خۆ هەنە کو پێکهاتینە ژ:

أ- جڤاتا ئێمناهیێ (ئاسایشێ).

ب- کۆمەلا گشتی

ج- چڤاتا ئابووری وکۆمەلاتی.

د- دادگەها دادیا نیڤ دەولەتی.

ه- ڕێکخراوا کارێ نیڤ دەولەتی.

و- چڤاتا سپاردان (مجلس الوصایا).

کو کۆمەلەکا لێژنان هەنە،پێکهاتینە ژ:

لێژنا گەشەپێدانا بەردەوام، لێژنا مافێن مرۆڤی، لێژنا گەشەپێدانا کۆمەلایەتی، لێژنا پێگەهاندنا ژنان، لێژنا نەهێلانا گونەهباریێ ودادپەروەیا جیهانی، لێژنا زانستی وتەکنولوژیا، ولیژنا کۆمەلێن مرۆڤی.

بۆ چەسپاندانا بنەمایێن مافێن مرۆڤی، نەتەوێن ئێکگرتی ب چەند ئاراستەکان کاردکەت:

**ئێک:** بەلاڤکرنا راگەهاندن وبنەما وراسپاردێن مافێن مرۆڤی، بۆ نموونە:

- جارناما جیهانییا مافێن مرۆڤی (١٩٤٨) ێ.
- ڕاگەهاندنا مافێن زارۆکان (١٩٥٩) ێ.
- ڕاگەهاندنا سەربخۆ پێدانا گەلان (١٩٦٠) ێ.
- ڕاگەهاندنا نەتەوێن ئێکگرتی بۆ ژناڤبرنا جودا هیکرنێ (١٩٦٣) ێ.
- ڕاگەهاندنا ژناڤبرنا جودا هیکرنێ دژی ژنێ (١٩٦٧) ێ.
- ڕاگەهاندنا ژناڤبرنا برساتییێ (١٩٧٤) ێ.
- ڕاگەهاندنا ژناڤبرنا مافێ گەشەکرنێ (١٩٨٦) ێ.
- ڕاگەهاندنا پاراستنا کەمەنەتەوان (الاقلیات) (١٩٩٢) ێ
- ڕاگەهاندنا کۆنگرێ نیڤ دەولەتی بۆ ژناڤبرنا توندرەوی وجوداهیکرنێ (٢٠٠١) ێ.

**دوو:** دارشتن و پەسەندکرنا چەندین پەیماننامان و رێککەفتنامێن نیف دەولەتی دبیاڤێ مافێن مرۆڤیدا، کو وەلات دڤێن ب ئێمزا وپەسەندکرنێن خۆ دناف دەستوور و یاسایێن خۆدا جهێ وان بکەن، ژوانا:

- رێککەفتناما ژناڤبرنا کۆمکوژیێ (١٩٤٨) ێ.
- رێککەفتناما جنیف (١٩٤٩) ێ.
- رێککەفتناما قەدەغەکرنا بازرگانیکرنا ب مرۆڤان (١٩٤٩) ێ.
- رێککەفتناما مافێن سیاسیێن ژنێ (١٩٥٢) ێ.
- رێککەفتناما مافێن مەدەنی وسیاسی (١٩٦٦) ێ.
- رێککەفتناما مافێن ئابووری ورەوشەنبیری وکۆمەلایەتی (١٩٦٦) ێ.

ل ئاستێ هەرێمین نافخۆیی دبوارێ مافێن مرۆڤیدا، وەرارکرنەکا بەرچاف هەیە، چەندین پەیماننامێن هەرێمی وکیشوەری کاردکەن بۆ پاراستنا دەستەبەرکرنا مافێن مرۆڤی وەك: هەردوو رێککە فتنامێن ئەورۆپا وئەمریکا بۆ مافێن مرۆڤی.

نەتەوێن ئێکگرتی وەك رێکخراوەکا نیف دەولەتی رۆلەکێ مەزن د نیف دەولەتیکرنا مافێن مرۆڤیدا هەبوو، ب رێکا رێکخستن و بەرهەڤکرنا رێککەفتنامێن نیف دەولەتییێن تایبەت د ڤی بواری و پێکئینانا دەزگەهێن تایبەت ب چاڤدێریکرنا مافێن مرۆڤی د گشت دەڤەرێن جیهانێدا .

**سێ:** سەرپەرشتیکرنا هێزا ئاشتی پارێز ودەستێوەردان دکاروبارێن ناڤخۆیێن دەولەتان دا ل دەمێ پێشیلکرنا مافێن مرۆڤی.

پشتی ئەو گوهۆرینێن مەزن یێن کو د بیاڤێ پەیوەندییێن نیف دەولەتیدا هاتینە گۆرێ، نەتەوێن ئێکگرتی شیا بسەرکەفتیانە سەرپەرشتیا هێزا ئاشتیپارێز بکەت دچەندین دەولەتێن جودادا ب مەرەما نەهێلانا شەڕان وپاراستنا خەلکێن سڤیل ژ دەستدرێژی وپێشیلکرنێن مافێن وان، هەروەسا ل دەمێ پێشێلکرنا ب

مەترسی یا مافێن مرۆڤی، نەتەوێن ئێکگرتی رێ دایە خۆ دەستێوەردانێ د کاروبارێن ناڤخۆییێن دەولەتاندا بکەت خۆ ئەگەر پێدڤی بکارئینانا هێزێژی کر بۆ راگرتنا پێشێلکاریان، وەکی بریارا (٦٨٨) ێ لسالا (١٩٩١) ێ یاتایبەت ب عیراقێ ڤە.

## تەوەرێ چارێ

### ساخلەتێن مافێن مرۆڤی:

مافێن مرۆڤی چەند ساخلەتێن دیارکری هەنە. ئەڤێن ل خارێ دیارترین ساخلەتێن مافێن مرۆڤینە:

١- مافێن مرۆڤی ناهێنە کڕین و فرۆتن، نەخەلاتەکە ژی کەسەکی دابیتێ، بەلکی ملکێ مرۆڤاتییێ یە ب ساخلەتێ مرۆڤبوونێ ڤە گرێدایە، مافێن مرۆڤی بۆ هەرکەسەکی مافەکێ رەسەنە وپێڤە گرێدایە.

٢- مافێن مرۆڤی خۆ ب خۆ مافێ هەر کەسەکییە بێ گوهـ بدەینە: ڕەنگ، ڕەسەن، ئایین، ڕەگەز، هزروبیرێن سیاسی، یان بنکێ کۆمەلایەتی... هتد.ئەم هەمی ب سەربەستی و وەکهەڤی و وەکی ئێك دسەفەرازیێ ومافاندا ژدایکبووینە، دڤێ راستییێدا ژی ئانکو مافێن مرۆڤی د شێوەی و ناڤەرۆکێدا مافەکێ جیهانییە.

٣- نابیت ب هیچ رەنگەکی ژ مافێن مرۆڤی بهێتە کێمکرن، چونکی بۆ کەسێ نینە ژبەر هەر ئەگەرەکێ بیت کەسەکێ دی ژوان مافان بێ بەهربکەت، خۆ ئەگەر یاسایا وەلاتەکی ژی دان ب وان مافان نەدانیت و پێشێلبکەت، ژ نرخێ وان کێم ناکەت، پێشێلکرنا مافان نەبوونا وان ناگەهینیت.

٤- مافێن مرۆڤی یەکەیەکا پێکڤە گرێدایە وناهێتە ژێکڤەکرن، چونکی مافێن مرۆڤی چ مافێن مەدەنی بن یان سیاسی یان مافێن ئابووری و کۆمەلایەتی بن، هەمی پێکڤە ئێك ئیکە پێکدئینن.

٥- مافێن مرۆڤی دبەرەف پێشڤە چوونەکا بەردەوام دانە ویا ب ئەزۆکیا (أنانیە) مرۆڤی ڤە گرێدایە، چونکی پێدڤیا مرۆڤی ژ ڕوییێ مادی و مەعنە ویڤە د وەرارەکا بەردەوامدایە، ئەڤەژی وێ دگەهینیت کو ئەرك وماف ژی د وەرارێ دابن و ببیتە فاکتەرەك بۆ پۆلێنکرنا چەندین مافێن دیتر. دێ شێن بێژین: مافێن مرۆڤی ستوینا هەڤپشکیا جڤاکی و شارستانیەتێن جۆراوجۆرە.

٦- فێرکرنا مافێ مرۆڤی کارەکێ زورێ گرنگە، چونکی ب شێوەیەکێ سەرەکی ڕۆلێ لێ بورین و دادوەری یا ناڤ جڤاك ودەزگەهان دا ب گشتی دبینن.

٧- مافێ مرۆڤی وەکی خۆ نامینیتەڤە، بەردەوام دوەرارێ دایە هەتا گەهشتیە ئەوێ چەندێ کو تنێ گرنگی یێ ب مافێ تاکی نادەت، بەلکی مافێ ئابوری و کۆمەلایەتی ژی ڤە دگریت، کو ب بەرەبابێ دوویێ دهێتە نیاسین. مافێ جڤاکی ژی وەکی مافێ گەشەکرن و وەرارو سەقاییێ پاقژ وئاشتی یا جیهانی بەرەبابێ سییێ یە.

٨- مافێ مرۆڤی پەیوەندی یەکا ب هێز پێکڤە گرێدەت ب جۆرەکی پێشڤەبرنا هەر ئێکی ژ مافان ل سەرحسابا ئێکی دی مەحالە، مافێ مرۆڤی جا چ مە دەنی و سیاسی یان ئابووری و جڤاکی و ڕەوشەنبیری بن، مافێ ل گەل ئێك وەك هەڤن ومەحالە ژ ئێك جودابکەن و دەولەت ژی ب دیڤ یاساییێ کارەکی بکەت هاوەلاتی ب مسۆگەری خۆشی یێ ژ مافێن خۆ وەربگرن. ڕاستی یا وێ ژی کو مافێ مرۆڤ ئێك ئێکە ژێك نەبرینە، نەتەوێن یەکگرتی ئێکبینە ژ ڕێکا وان ئەرکێن جۆرا و جۆرێن تشتا ئێك لا دکەنەڤە کو گرێدایی بن ب مافێ مرۆڤی ڤە، بگرە د وان ڕوویان ڤە داکوکی یێ ل سەر ئەوێ دکەن، کو بەلگەنامەکا مافێ مرۆڤی نینە ئێك ئێکە و پێکڤە گرێدانا مافێ مرۆڤ ئێك لانەکەت. د ڕاگەهاندنا کونگرێ جیهانی یێ مافێ مرۆڤی دا کو ل ماوێ (١٤ - ٢٥) ێ خزیرانا (١٩٩٣) دا ل (ڤیەنا) گرێدای هاتی یە (گشت مافێن مرۆڤی ئێك ئێکە پێکڤە گرێداینە و ژ ئێك دوو ناهێنە ژێك جوداکرن،

## پۆلینکرنا مافێن مرۆڤی

ژبەر وێ چەندێ کو مرۆڤ جەمسەرێ هەمی مافانە وسەرجەمێ وان مافان ژی ژ پێخەمەت بەرژەوەندی یا وی دایە و ب پیڤەرەکی ژی کو مافێ مرۆڤی ل قۆناغا گەشەکرنێ دا ب چەندین قۆناغێن جودادا دەربازبوویە و دگەل ئایدلۆژیان وهزرێن جودادا رێکاخۆ گرتیە. کەفتی یە بن کاریگەری یا سیاسی وئابووری و یاسایی و ئایین و کۆمەلایەتی و بیروباوەران، لەورا چەندین جۆر ژ کۆمەلێن مافی بۆ دەستە بەرو پێشچاڤ کرینە، کو هەر ئێکێ پێکهات و نیشانێن تایبەتێن خۆ هەنە ئەوژی پێگڤە مافێ مرۆڤی پێکدئینن ئەو مافێ مرۆڤی پێڤەرێ بنەڕەتی یێ ژیانا گونجای و مەدەنیە و ئارمانجا وی هەر پێشکەفتناکا جڤاکی یەژی ل وی کوژی یێ بەرچاڤ ڤە مافێ مرۆڤی ب چەندین شێواز و جۆران پۆلێن کرییە، د ڤێرەدا تنێ مافێن مەدەنی و سیاسی و جڤاکی و ئابووری ورەوشەنبیری دێ ئێخینە بەرچاڤ.

# تەوەرێ ئێكى

## مافێن مەدەنى وسياسى:

ئەو جۆرە مافن كو ب مافێن كلاسيكى بەر نياسن ب چار چوڤێ دەستە بەركرنا ئازادى و مافێ تاكە كەسى و رێگرتن ژ دەستێوە ردانا حكوومەتێ و چالاكيێن مرۆڤى ڤەدكۆلن؟ ب ئەگەرێ گرنگى وكاريگەرى ياوان دئاڤاكرنا مرۆڤى وپێكئينانا جڤاكێ مەدەنى، دچەندين پەيمان ورێكەفتنامێن نيف دەولەتى دا جهێ وان بۆ ڤەكرييە وپێگەهێ جيهانى ونيف دەولەتى بۆ دياركريە، پەيماننامە مافێن مەدەنى و سياسى يا سالا (١٩٦٦) كو ژ لايێ نەتەوێن ئێكگرتى ڤە پەسەندكرييە گرنگترينى يا وێ پەيمانێ كو دڤێت دەولەت بجهبينن ولڤان رێكێن خارى ژى پێگيربن:

أ- ئەنجامدانا چاكسازى يا ياسايى ودەستوورێ .

ب- پەيداكرنا زەمينە يەكێ بۆ مرۆڤى هەتا سكالا وشكايێتان ڕابگەهينن هەتا ئەگەر پێشێلكا ڕو شكايەت لێكرن يێن دەولەتى و دەزگەهێن وێ ژى بن. ڤەكۆلين و ديتنا سكالان ژى دەزگەهەكێ دادەورى يێ گونجاى و ياسايى يێ دادپەروەرى يێ وەسا بۆ دابين ومسۆگەربكەن هەتا هەر بريارەكا دادگەهێ كو د بەرژەوەنديا سكالا كەرى دا دەربێخيت بجهبينن.

چێدبيت دڤێرە دا ئاماژێ بۆ هێلێن گشتيێن وان مافان بكەين.

١- مافێ گەل و نەتەوا د دياركرنا چارە نڤێس ومفاديتن د بكارئينانا ئازادانە ياسەروەت وسامانێ سروشتى.

٢- مافێ ژيانێ دڤێت دڕێيا ياسايێ دا بهێتە پاراستن وكەس ژى لێ بێ بەهر نەبيت.

٣- قەدەغەكرنا ئەشكەنجەدانێ وئازارگەهاندنا لەشێ مرۆڤى وسزايێن گران و كەرامەتاوى نەهێتە شكاندن.

٤- قەدەغەكرنا بەنداتییێ وكار پێكرنا نارەوا ب مرۆڤی ڤە.

٥- پاراستنا بارێ ئاسایشا كەسایەتی یا مرۆڤی وقەدەغەكرنا گرتنا نارەوا.

٦- د بەرامبەر یاسایێ ودەستهەلاتا دادوەری دا وەك هەڤبن.

٧- ئازادی یا هزر وبیرێن ئاینی.

٨- پێكئینانا كۆمەلان ورێكخراوێن سیاسی وئەندام بوون دناڤدا.

٩- مافێ خێزانێ وهەڤژینی یێ.

ئەڤ مافێن خارێ نموونا چەند مافێن سیاسی نە:

## ئێك: مافێ دروستكرنا كۆمەلان ورێكخراوێن سیاسی:

مافێ بیرورا و دەربڕینێ ئێكە ژ مافێن بنەرەتیێن مرۆڤی ، پیڤەرەكە ژپیڤەرێن دیموكراتیا هەر سیستەمەكێ سیاسی مافێ بیرورا ودەر برینی تنێ ب ئارمانج نینە، بەلكی هۆكارەكە ژ پێخەمەت بەرژەوەندیێن گشتی هەول ددەت بۆ چارەسەری یا جڤاكی و دەزگەهـ و دەربڕینێن جودا و وەرار و پێشكەفتنا وان، چونكی مافێ بیروراودەر برینێ گازیكرن نینە بەلكی مەرجەكێ بجهئینانا جڤاكەكێ ئازادە. ئەگەر بیاڤێ ب ساناهی بۆ وەرگرتنا زورترا پێزانینان نە پەیدابیت ئەڤجا مافێ رادەربرنێ ژی نابیت، دڤێت تشتەكی بزانیت ئانكو پێزانین ل دەف بن هەتا بارێ سەرنج ورایەكا وەسا ژلایێ تەڤە مسۆگەر بكەت كو ئارمانجاتە بەرژەوەندی یا گشتی و بلندكرنا ئاستێ جڤاكی بیت ئەڤجا ژ ڤی بیاڤی ڤەباخڤیت مافێ ئازادی یا هزر وبیران سێ ئاستان ڤە دگریت:گەریان لدویڤ راستی یێ، كۆمكرنا پێزانینان، كۆمكرنا پێزانینان ل سەر ڤی بیاڤی، هزركرن وب عەقلیكرنێ دابگەهیتە ئەنجام وئەڤجا بۆچوونا خۆ دەرببڕی.

دشێن بێژین ئازادی یا بیرورا و دەربڕینێ ببیتە ئەگەرێ سەرهلدانا کارەکێ دی ئەوژی د دروستبوونا کۆمەڵان و ڕێکخراوێن سیاسی دا ب دیار دەردکەڤیت لەورا پێدڤیە مرۆڤ ب حەزا خۆ وان کۆمەڵ ورێکخراوێن سیاسی هەلبژێریت کو مەرەما وی بن، ب بەروڤاژی هندەك ژوان رێکخراوێن سیاسی د وەڵاتەکیدا دەستهەلات ب چەندین رێکێن نەدورست کەفتیە دەست خەلکی نە چار دکەن بچنە دناڤ ڕێکخستنێن وان دا ئازادی ڕامانا بەرفرەها خۆ ژگەلەك لایەنان ڤە دگریت، ئێك ژوان لایەنان مافێ دامەزراندنا کۆمەڵە ورێکخراوێن سیاسی نە. کۆمەڵ ورێکخراوێن سیاسی ژ پێخەمەت ب ئەنجام گەهاندنا چالاکیێن سیاسیێن گرێدایی ب کێشێن سیاسی دهێتە گۆڕێ. یا ئاشکرایە پڕانی یا وەڵاتێن دونیایێ جودانە، لەورا چێدبیت خەلکێ سەرب هەر هزرەکێ کۆمەڵ و ڕێکخراوێن سیاسیێن تایبەت بخۆڤە هەبن.

## ڕاهێنان

١- مەرەم ژ کۆمەڵ و ڕێکخراوێن سیاسی چییە؟

٢- ئەرێ کۆمەڵەك یان ڕێکخراوەکا سیاسی کەسەك بتنێ دێ دامەزرینیت؟

٣- ئەرێ یا سایەکا دیارکری بۆ دامەزراندنا کۆمەڵ و ڕێکخراوێن سیاسی هەیە؟

٤- چێدبیت نەتەوەیەکی یان ئاینەکی یان تەخەیەکێ زێدەتر ژ رێکخراوەکا سیاسی هەبیت؟

٥- دشیاندایە یاسا ڕێکێ بۆ دامەزراندنا ڕێکخراوەکا سیاسی بدەت کو کوشتن وکاڤلکاریێ و شەڕو تێکدانان بەلاڤ بکەت، یان پڕوپاکندێ بۆ مەرەمەکا ژ وی بابەتی بکەت؟

## دوو : مافێ هەلبژاردنێ:

گشت دەستهەلاتدارێن جیهانێ سیستەمێ رێڤەبرنا وان هەر چاوابیت دانپێدانێ ب وێ چەندێ دکەن کو ((گەل ژێدەرێ دەستهەلاتێ یە)). بەرێ کو رێژا ئاکنجییێن باژێرەکی یان دەڤەرەکێ ب رادێ نهو نەبۆون، بۆ نموونە ل یونانا کەڤن ل جهەکێ ئەسینا یا پایتەخت هەمی ئەو کەسێن بۆ دەنگدانێ دیار دکرن کۆم دکرنەڤە و دەربارەی کێشا گرێدایی ب باژێرێ وان ڤە بیرو بۆچوونێن وان وەردگرتن. بەلێ دڤی سەردەمێ ئەڤرۆدا کو هەم هژمارا ئاکنجیان و هەم هژمارا دەنگدەران زێدە بۆویە وبەردەوام ل زێدەبۆونێ ژی دایە و هەم چارچوڤێ بیاڤێ دەستهەلاتێ هند بەرفرەه بۆویە کومکرنا وان ئاکنجیان و ئێکلاکرنا وێ کێشێ و بریاردان و زانینا






بەشداریکرن ل هەلبژاردنا مافەکێ ئاسایێ یێ هەمی هەڤ وەلاتیانە

داخازێن وان مەحالە، لەورا هەر وەلاتەك ب دویف یاسا و دەستوری هژمارا ئاکنجییێن خۆ بۆ هەر چەند هزار کەسا نوینەرەك دەستنیشان دکر بەرێ سەرۆکێ هۆزێ یان شاهێ وەلاتی نوینەرێن خۆ دەستنیشان دکرن بۆ کەسێ ژی چێنە دبۆو ژ بریارا وی دەربکەڤیت، هەتا کار گەهشتیە هەلبژاردنا ئاشکرا و پاشی ب رێکا دەنگدانا نهێنی. دەسپێکێ ل پرانیا وەلاتان تنێ کەسەك دەستنیشان دکر کو دگۆتێ زەلامێ ماقویل، مافێ دەنگدانێ هەبوو.

د دویڤدا ب ئەگەرێ پیشکەفتنا جڤاکی و وەرارا وی ل گەلەك وەلاتان كۆمەلْ و ڕێكخراوێن سیاسی و كۆمەلایەتی و روشنبیری هاتنە گۆڕێ و ئەو مافە بۆ سەرجەم نێرێن وەلاتی كو ژ ژییەكێ دیاركری دابن مسۆگەركر، هەتا دەمەكێ درێژ ڕەگەزێ مێ لێ بێ بەهركرن. ئەگەر چ نهو د پرانیا وەلاتێن دونیایێ دا ئەو مافە بۆ مێیان ژی مسۆگەركری یە، بەلێ هەولدان بۆ بدەستڤەئینانا مافێ دەنگدانێ و جوداهی نەكرن دگەل نێران دا د سەرانسەری دونیایێ دا بەردەوامە و كری یە ئەركەكێ سەرەكی یێ پرانیا رێكخراوێن مرۆڤی و سیاسی.

گەلەك ژ زانایێن ڤی بیاڤی هەلبژاردنان ب مافەكێ مەدەنی و سیاسی یێ هەڤوەلاتی دادنن كو سەربەست بیت د كارئینانێدا، ب رامانەكا دی هەلبژاردن و دەنگدان دبن چ جۆرە گڤاشتناندا نەبیت و ب چ شێوەكی زۆری یێ تێدا بكارنەئینن.

دەربارەی هەلبژاردنان سێ بیردۆز هەنە:

## ئێك: بیردۆزا مافێ كەسایەتی:

هزرڤانێن ڤێ رێبازێ وەسا هزر دكەن كو هەلبژاردن مافەكێ تاكە كەسی یە ب پیڤەرێ هەڤ وەلاتیێ، مافێ هەڤ وەلاتیبۆونێ وەك ئێك مسوگەر دكەت، لەورا چێنابیت كەسێ لێ بێ بەهر بكەن ئانكو مافێ هەلبژاردنێ مافەكێ ئارەزومەندانەیە، لەورا دشێت پشكداریێ بكەت یان پشكداریێ نەكەت.

## دوو: بیردۆزا وەزیفی:

هندەكێن دی وەسا هزر دكەن هەلبژاردن ئەركە نە مافە، ئەڤەژی وەدكەت كو مرۆڤ نەچار ببیت ل سەر پشكداربۆونێ د هەمان دەم ژی دا دبیتە ئەگەرەك بۆ سنوركرنا ئازادی یا وان وبێ بەهركرنا هەڤوەلاتیان ژ ئازادی یا مافێ پشكداربوونێ یان نەپشكداربوونێ.

## سێ: بیردۆزا یاسایی:

هەڤالبەندێن ڤێ بیردۆزێ وەسا هزردکەن هەلبژاردن دەستهەلاتەکا یاساییە و یاسا بۆ دەنگ دەران مسۆگەردکەت و مەرج و شێوە و رێکخستنێ ب یاسایێ دکەت، ئانکو ب دەستهەلاتکرنا یاسایا هەلبژاردنێ. هەلبژاردن د بەرژەوەندا جڤاکی دا یە نەیا تاکە کەسی. ناڤەرۆك و مەرجێن بکارئینانێ ب دیف یاسایێ وب شێوەیەکێ وەك هەڤ بۆ سەرجەم دەنگدەران دابین دکەت بێ کو رێکێ ب دەنە کەسەکی کو ب دویف دلێ خۆ ناڤەرۆکێ یان مەرجێن وێ بگوهۆریت.

## راهێنان

١- ژی پەیوەندی ب هەلبژاردنان ڤە هەیە؟

٢- تو هەلبژاردنا ب ماف یان ئەرکێ تاکەکەسی ددانی؟ بەلگێ تە چییە بۆ بەرسڤاتە؟

٣- هەلبژاردن نیشانا دیموکراتی یێ یە؟ بۆچوونا خۆ روهن بکە.

٤- شێوێن هەلبژاردنان چنە؟

٥- ئەگەر هەلبژاردن ئەرك بیت، دەنگدەر د پشکداریکرن و نە پشکداریکرنێ دهەلبژاردنان دا ئازاد دبیت؟ ڤەکۆلینێ لسەر بەرسڤا خۆ بکە.

٦- ب بۆوچوونا تە ب ئەرك کرنا هەلبژاردنان ئازادی یا تاکە کەسی بەرتەنگ دکەت یان نە؟ نموونان بۆ بەرسڤا خۆ بینە.

## سێ: مافێ خۆنیشادانان:

ئێك ژمافێن مەدەنی وسیاسێن مرۆڤی، دەربڕینا نەرازیبوونێ یان خۆشیێ یە، نەرازیبۆون یان خۆشی، ب چەند شێوازان دهێتە دەربڕین ئێك ژوان خۆنیشادانە..



نموونا خۆنیشاندانێن هێمن

خۆنیشادان مافەكێ سیاسی یێ مرۆڤی یە، بۆ دەربرینا نەرازیبۆونێ یان بجهئینانا ئارمانجەكێ كۆمەڵەك یان چەند كۆمەڵ بكاردئینن.. بەلێ كو بۆ نەرازیبوونێ بیت پێدڤیە بەراهیكێ چەند هەولدان بۆ چارەسەری یا وێ كێشێ كربن و هەمی رێكێن یاسایی ب كارئینابن و بێ هیڤی بین كو چ رێكەك نەمان، پاشی پەنایێ بۆ خۆنیشادانێ ببەن.



نموونا خۆنیشادانەكێ كو توندوتیژی تێدا بكارهاتیە

خۆنیشادان د پڕانیا دەولەتێن جیهانێ دا ب حەزا خۆ ناکەن، بەلکی ب دویڤ یاسا و مولەت وەرگرتنێ ژ دەولەتێ خۆنیشادانا دکەن، ئەگەر وەسا نەبۆو ئەڤجا دویرنینە دەولەت ب سەرپێچیکرنەکا یاسایی ل قەلەم بدەت، چونکی مافێ خۆنیشادانێ مافەکێ رەهایی نینە دا هەر کەسەك راببیت و سەربخۆ دەست پێ بکەت، لەورا گەلەك جاران د خۆنیشاندانانەدا تێکدان پەیدا دبیت و مافێ کەسانێن دی دهێتە پێشێلکرن... پێدڤیە ئەو کەسێن داخازا مولەتا خۆنیشادانێ دکەن، لیژنا سەرپەرشت بن و ب روهن و ئاشکرایی مە بەستا خۆنیشادانێ رابگەهینن و رێك و جهێ خۆ ژی دیار بکەن وژێ نەدەرکەڤن. پێدڤییە دەولەت ژی مولەتێ ب ساناهی بدەتێ و ئها هۆسا ئەرکێ ئاسایش و پۆلیسان پاراستنا خۆنیشاندەران و خۆنیشادانێ یە دڤێت گرتن و راهێلانا وان نەبیت.

دەولەت هەنە رێکێ بۆ کەسێ نادەن خۆنیشادانێ دژی وێ بکەن لەورا گەلەك جاران د بن سیبەرا رژێمێن دکتاتۆری دا لایەنێن هەڤرك خۆنیشادانێ ب شێوەیەکێ نهێنی ڕادگەهینن، چونکی دەربڕینا نارەزاییێ د ڕێکا خۆنیشادانێ دا قەدەغەیە، د وی دەمی دا شەڕو پێکدادان دناف بەرا خۆنیشادەران و پۆلیساندا پەیدا دبن هندەك جاران چەك ژی دهێتە بکارئینان و کارەساتێن مەزن لێ پەیدادبن.

## ڕاهێنان

- ته پشکداری د چ خۆنیشادانادا کریه؟
- ته پێ خۆشه ب زۆری ته بێخنه دناڤ ریزێن خۆنیشاداناندا؟
- هەمی دەولەت رێ ددەن نەرازی بوون درێکا خۆنیشاداناندا بهێنه کرن؟
- ئەگەر کومەڵەك یان رێکخراوەکا سیاسی کێشەك دگەل لایەنەك یان دەزگەهەکی دا هەبیت، دشێن ئێکسەر خۆنیشادانێ بکەت؟
- ئەگەر نە، تو کیش رێکێ نیشاددەی؟
- مەرجە هەر خۆنیشادانەك سیاسی بیت؟
- کەس ژ هەوە پشکداری د خۆنیشانداکێ دا کریه و دەستهەلاتدارییێن وی بازێری پێ ئاگەهدار نەکربن؟
- دژێر سیبەرا دەولەتێن دکتاتۆری دا، ئەرێ ڕێ دایه بەرهنگاران خۆ نیشادانان دژی رژێمێن وان بکەن؟ ئەگەر نە، دوی دەمی دا دێ چ ڕویدەت؟

## چار: مافێ پەنابەریێ:

هەر ژ کەڤن دا خەلك ژ پێخەمت پاراستا خۆ، نەچار دبۆون ژوەلاتێ خۆ ب رەڤن و پەنایێ بۆ دەولەتەکا هەڤسوی یان هەر دەولەتەکا دی ببەن هەردوو جەنگێن جیهانی و جەنگێن بەری وان ژی کێشەکا وەسا ئینایە گۆرێ، د جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی دا بەندەك بۆ تەرخانکر.

ڕۆژانە خەلکی بڕیارا ب جهێلانا وەلاتێ خۆ ددان. هندەك ژ وان ژ ترساندا، ژ ژیانا خۆ و خێزانا خۆ دترسیان. هندەکێن دی ژی ب نەچاری ژبەر بارێ نەوەکهەڤیا کۆمەلایەتی یان ئابۆری مل دایە پەنا بەری یێ. گرنگترین مافێ هەڤپشك دناڤبەرا سەرجەم پەنابەران و داخازکەرێن پەنا بەریێ و کوچبەران و ئەوێن هاتینە مشەختکرن ل نافخۆدا ب زوری، مافێ وەکهەڤی یێ وب ئێك چاڤ تەماشەدکەت.

پەنابەر ژ ئەنجامێ کەم خەمی یێ و خۆڤەدزینا حکومەتێن وان ژ پاراستنا مافێ وان یێ (مرۆڤایەتی یێ) د رەڤن هندەك ژوان حکومەتان ئەو ب خۆ پێشلکاریان دکەن، هندەکێن دی ژی شیانا بەرهەنگاری یا رویدانێن وان پێشلکاریان نینە. دگەل ئەوێ ژی دا حکومەت و راگەهاندن دچەند لایەکێن ئەڤێ دونیایێ دا، پەنابەران وەك گرفت و بگرە ((تیرۆریست)) نیشاددەن و هەندەکێن دی ژی ب رەڤیاییێن ژ دەستێ تیرۆرێ، یان پێشیلکارییێن نەهەموا رییێن مافێ مرۆڤی دزانن.

هەتا نهو زێدەتر ژ ١٤٠ حکومەتان، رێکەفتناما سالا (١٩٥١)ێ یا نەتەوەیێن ئێکگرتی یا تایبەت ب بارێ پەنابەریێ ڤە کو ب (رێکەفتناما پەنابەری یێ) ناڤکریە و ئیمزا کرینە. ئەڤێ رێکەفتنامێ پێناسەك بۆ پەنابەران دانایە و هەمی ل سەر رێکەفتینە. ئەو ژی ((پەنابەر کەسەکە ژ دەرڤەی وەلاتێ خۆ دژیت ب ئەگەرێ ناسناما وی و بیروباوەرێن وی، د وەلاتێ خۆدا ب راستی گەلەك پێشێلکاری د مافێن وی دا دهێنە کرن.

نەشێن بۆ وەلاتێ خۆ ڤەگەرنەڤە، چونکی دەستهەلاتدارێن وەلاتی وی نەشێن یان نەڤێن پاراستنێ لێ بکەن)).

پەنابەر د ڤەگەریانا وی دا بۆ وەلاتێ وی، رەنگە روی ب رویی تەپە سەریێ ببیت، لەورا نابیت پەنابەر ب زۆری بۆ وەلاتێ وی بهێتە زڤراندن، ئەڤە مافەکێ وی یێ سەرەکی یە خۆ ئەگەر کەسەکی ژی مافێ پەنابەری یێ نە دابیتێ رێکخراوێن مافێ مرۆڤی رازی نابن ب زۆری بزڤرینە ڤە بۆ وەلاتێ وی، چونکی دبیت مەترسی یا زیندانکرنێ و ئەشکەنجەدانێ ول سێدارەدانێ هەبیت.

پەنابەر ژی وەکی هەر مرۆڤەکێ دی گشت مافێ مرۆڤایەتی یێ هەیە زێدەی ڤێ وەك پەنابەرەکی ژی مافەکێ دی هەیە، ژ وانا:-

- نابت جوداهی یا وی بهێتە کرن دگەل ئاکنجیێن وی وەلاتی.
- سەربەستی یانە پەیرەوا ئایینێ خۆ بکەت.
- بەلگەنامە و ناسنامە و پاسپۆرتا وی بهێتە پاراستن.
- مافێ کارکرنێ هەبیت.
- جهێ حەواندنێ و فێرکرنێ و هەوارهاتنا وی بۆ بهێتە دابینکرن.
- بە ئەگەرێ هاتنا وی یا نەیاسایی نەهێتە غرامەکرن.
- سەربەستی یا هاتن و چوونێ هەبیت.

رێکخراوێن نیڤ دەولەتی، بۆ بدەستڤەئینانا مافێ پەنابەریێ، دوپات دکەن لسەر:

- رێ ل کەسێ نەهێتە گرتن بچیتە وەلاتەکی داخازا پەنابەریێ بکەت.
- ب دادوەری سەردەریەکا دیارکری دگەل پەنا بەرێن خۆ بکەت.
- نەهێنە گرتن، تنێ ئەگەر ب تاوانەکا دیارکری نەهاتبیتە گونەهبارکرن.
- بشێن پەیوەندی یێ ب خێزان و پارێزەر و کەسەکی کو ب کارێ وەرگێرانێ رابیت بکەن، ئەو رێکخراوێن کو کاران بۆ بساناهی دکەت، وەك (( کۆمسیونا بلندا کاروبارێن پەنابەرێن سەرب نەتەوێن ئێکگرتی ڤە)).

مافێن بنەڕەتییێن ئابووری و کۆمەڵایەتی و رەوشەنبیری، وەك کارکرن و فێربوون و هاریکارییێن کۆمەڵایەتی یێن وان دپاراستی بن.

جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی د بڕگا (١)ێ بەندێ (١٤)ێدا دبێژیت:

((هەر کەسەکی کو ژ تەپەسەرکرنێ ڕەڤی بیت، مافێ پەنابرنێ یان پێکول بۆ پەنابرنا وەڵاتەکێ دی هەیە)) چونکی هەر کەسەکێ داخازا پەنابریێ بکەت، ڕەنگە ب ڕاستی پەنابەربیت، لەورا دڤێت هەمی مافێن پەنابەریێ هەبن، بتنێ ئەگەر پەنابەر نەبوونا وی لێ ئاشکەرابۆو.

پێدڤییە چارەسەریەکا بەردەوام بۆ مرۆڤی پەنابەر ببینن، چارەسەری ژی رەنگە ب تێکەلبۆون و خۆ گونجاندنێ دگەل خەلکێ ئەوی وەڵاتێ یێ پەنا بۆ بری، یان د وەڵاتەکێ دی دا ئاکنجی بیت یان ب حەزا خۆ ڤەگەریتەڤە بۆ وەڵاتێ خۆ. بۆ ئەڤا داوی یێ، ئانکو ڤەگەراندنا وی ب حەزا وی بیت، سەر بلندی و رێزگرتنەکا تەمام ل مافێ مرۆڤی بگریت، چونکی مێژوویێ یا سەلماندی، نە ئارامی یا هەر وەڵاتەکی وەل خەلکێ وێ دکەت جارەکا دی ژی بڕەڤنەڤە.

## کوچبەر ( مشەختبووی ) کییە؟

هەمی ئەو کەسێن ژوەڵاتێن خۆ درەڤن وپەنایێ دبن بۆ وەڵاتەکێ دی، هەر بتنێ ژبەر ترسێ و ئەشکەنجەدانێ و کوشتنێ نینە، بەلکو خەلکەك هەیە بۆ باشکرنا ژیارا خۆ و مال و زارۆکێن خۆ ئاوارەدبن. ب کورتی یا وێ کەسانەك کو ژ جهەکی دچیتە جهەکێ دی. دبیت ژ بەر ترسێ یان برسیێ یان مسۆگەرکرنا ئارامی یێ و سەلامەتی یا وی و خێزانا خۆ نەچار کربن کو مشەخت ببن. دبیت ژی تێکەلبۆونەك ژ وان هوکاران پالدابیت ڤان جورێ کەسان دبێژنێ کۆچبەر (پەنابەر).

کوچبەری ژی وەکی هەر مرۆڤەکێ دی مافێن مرۆڤایەتییێ هەنە وەك مافێ ژیانێ، بێ ئەگەر نەهێتە گرتن و ئەشکەنجەدان و ژیانەکا هەژی مرۆڤی بۆ وان هەیە. چەند پیڤەرەکێن یاساییێن نیڤ دەولەتی وەسا هەنە بەحسێ مافێ کرێکارێن کوچبەر دکەن. وەك رێکەفتناما رێکخراوا کارێ نیڤ دەولەتی. د (١)ێ تەممۆزێ (٢٠٠٣) دا رێکەفتناما پاراستنا سەرجەم کرێکارێن کۆچبەر و ئەندامێن خێزانێن وان ئیمزا کریە. کو ئەو ژی دان پێدانەکا گرنگە ب وی مافێ کۆچبەران دڤێت بهێتە پاراستن.

مەرج نینە کوچبەر ژ وەلاتەکی بچیتە وەلاتەکێ دی، بەلکی رەنگە ژ جهەکێ وەلاتێ خۆ بچیتە جهەکێ دی دهەمان وەلات دا، جوداهی دناڤ بەرا پەنابەر و کۆچبەرێ ناڤخۆ، کوچبەرێ ناڤخۆ ژلایەکێ وەلاتێ خۆ دچیتە لایەکێ دی، بەلێ پەنابەر دڤێت سنۆرێ نیڤ دەولەتییێ وەلاتێ خۆ ب بەزینیت. گەلەك جاران کۆچبەر وەکی پەنابەری یە، ژبەر ترسا شەروشوران یان ژناڤ برنا رەگەزی یان تەپەسەریا ئایینی یان برسایە تیێ درەڤیت.

خەملاندنێن سالا (٢٠٠٣) هەبۆونا (١٧٥)ملیۆن کۆچبەران د دونیایێ دا راگەهاندیە، ئەو ژی ژ (٢،٨٪)ێ ژئاکنجییێن دونیایێ نە کو نهو ب (٦،٣) ملیار مرۆڤان دخەملینن. نزیکێ (١٠،٤) ملیۆن پەنابەر ژی ددونیایێ دا هەنە، ئانکو خۆ ژ (٠،١٧٪) ێ ژ ئاکنجییێن دونیایێ دەت. نهو ژمارا کۆچبەرێن ناڤخۆیی ژی خۆ ژ (٢٥،٨) ملیون کەسان ددەت، ئانکو ژ (٠،٤٪) ئاکنجییێن دونیایێ یە.

پرانی یا پەنابەرو کۆچبەرێن ناڤخۆی د هەردو کیشوەرێن ئاسیا و ئەفریقیا دانە کو هەردو پێکڤە (٩،٢) ملیۆن پەنابەر و (١٨،١) ملیۆن کوچبەرێ ناڤخۆیی ب خۆڤەگرتینە.

## ڕاهێنان

- مافێ پەنابەریێ چییە؟

- پەنابەر کییە؟

- چەند جۆرێن پەنابەران هەنە؟

- نهو پەنابەری بوویە گرفتا دونیاییێ یان نە؟

- تە کەسەکێ پەنابەر هەیە؟

- ئەگەر هەبیت ئەگەرێ پەنابەریا وی دزانی؟

- ژ وان ئەوێن تو دنیاسی هەمی ئەون ئەوێن ژ ترسا گیانێ خۆ ڕەڤینە یان ئەگەرێن دی هەنە بۆ ڕەڤینا وان؟

- تو دبێژی هەر کەسانەکێ سیاسی ژ ترسا گیانێ خۆ برەڤیت.

- ئەرێ تۆ گەهشتیە بارەکێ وەسا هزرا پەنابەریێ تە کربیت؟

- هەمی ئەوێن وەلاتێن خۆ بجهـ دهێلن، ب پەنابەر دزانن؟

- ئەگەر نە، چ جورە وەلاتەکی بجهێلانەکا دی هەیە؟

- ئەگەر بارەکێ نە ئاسایی د وەلاتەکی دا بهێتە گۆرێ، ئێك وەکی هەمی ئاکنجیێن وی وەلاتی، نە ئارامی یا وەلاتێ وی پال دایە کو برەڤیت، جۆرێ پەنابەریا کەسەکێ وەسا چیە؟

- مەرجە کۆچبەر ژ وەلاتەکی بچیتە وەلاتەکێ دی؟

## پێنج: مافێ بدەستڤەئینانا پلە و پایەیان:

هەمی کەسا، ل دویڤ یاسا و رێنماییێن وەلاتێ خۆ و شیان و لێهاتنێن خۆ بۆ وەرگرتنا پلە و پایەیان، ومافێ هەڤرکرکنێ هەیە و نابیت رەگەز، توخم، نەتەوە، ئایین، زمان، رەنگ یان هزرو بیر د وەرگرتنا پلە و پایێن راگەهاندی دا رێگربن. مرۆڤ ل هەر جهەکی و ب هەر زمانەکی و ول هەرنەتەوەیەکی وب هەر رەنگەکێ هەبیت و خۆدانێ هەر بیروباوەریەکێ بیت، وەك مرۆڤ مافێ وەرگرتنا کارێن گونجای و دشیانێن وی دا بیت. زێدەتر ژ وی ژی دسیستەمێ دیموکراسیدا پەیرە و کریە. د وەلاتەکی دا بۆ هەر پۆستەکێ دیارکری کەسانەك ل سەر بنەماییێن هەر پیڤەرەکی بهێتە دانان، ژبلی هەڤوەلاتی بۆونێ و ئەو مەرجێن یاساییێن پێدڤی دوی کەسی دا هەبن پێشلکرنەکا دیار و ئاشکەرایا مافێ مرۆڤیە، چونکی نە وەکهەڤی یێ دئینیتە گۆرێ... ناچێبیت پلە و پایە وەرگرتن ب هزر و بیرێن پەیوەندییێن کەسانەکی ڤە د گرێدایی بن کو خۆدان دەستهەلات بن، چونکی ئەگەر وەسابیت ژ لایەکی جوداهی دناڤ بەرا مرۆڤاندا دهێنە کرن و ژلایەکێ دی ڤە پالدانا خەلکەکی بۆ چوونا دناڤ حزب و رێکخراوێن دەستهەلاتدار، کو ئەو ژی پێشلکاریەکا بەندێ (١٢٠) یێ ژجارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی یە: ١- هەرکەسەکی مافێ ئازادی و پشکداربۆونێ د کۆمەڵ و دەستەك و تاقمێن ئاشتی خۆازدا هەیە. ٢- نابیت چ کەسەك پەستان لێبهیتەکرن بچیتە دناڤ رێزێن کۆمەڵەکێ دا.

چەند بەندەکێن دیێن جارناما جیهانی یا مافی مرۆڤی گرنگی بڤی لایەنی دایە. ((هەر کەسەك بێی جوداهی مافێ موچێ وەکهەڤ د کارەکێ وەکی ئێك دا هەیە)) ئەڤە ژی برگێ دووێ یە یی بەندێ (٢٣) یێ، برگێ ئێکێ یێ بەندی (٢١) ژی دبێژیت: (( هەر کەسەکی وەکهەڤی یا مافێ وەرگرتنا کارو فەرمانبەریێن گشتی د وەلاتێ خۆدا هەیە)). کو ئەوژی هەمان مەرەم ڤەدگریت... ب شێوەکێ گشتی، نابیت پلە و پایە، ژبەر هەر جۆرە پەیوەندی یا کەسی ب دەستهەلاتێ ڤە، د چەند کەسێن دیاریکری دا پاوان بکەن.

## ڕاهێنان

- ئەرێ شارەزاییێ ب مەرجەکێ سەرەکی یێ د هەڤرکیکرنا وەرگرتنا پۆستەکێ دیارکری دادنن؟
- ((هەر کەسەکی مافێ کارکرنێ و ئازادی یا هەلبژارتنا کاری ل بن سیبەرا گەلەك مەرجێن ڕەوا و ماقویل دا هەیە، هەروەسا مافێ پاراستنێ، ژ بێکاریی هەیە)). ئەڤە دەقێ بڕگا ئێکێ بەندێ (٢٤) ێ ژ جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی یە. ئەو دەقێ مافێ بدەستڤەئینانا پلە و پایەیان ڤەدگریت؟ روونبکە.

### شەش: مافێ گەلان ژ دیارکرنا چارەنڤیسی و مافێ کێمە نەتەوان:

پشتی دروست بۆونا دەولەتا نەتەوەیی[1]، کێشا کەمینەیان ب ڕێکەفتن یان ب زۆری ب دەولەتەکا دیارکری ڤە گرێدابیت، سەرهلدای. جوداهیکرن دناڤبەرا مرۆڤێن ئێك دەولەت دا، هەستێ نە وەکهەڤی یێ ژ لایێ کەمینێ ڤە دهێتە گۆرێ وەلێ دکەن، ژبلی مرۆڤایەتی یا خۆ هزرێ ژ ڕەسەنەتیا خۆ وئەگەرێن جوداهیا خۆ بکەت وب وێ زورداریێ و ستەمکاریێ و تەپەسەری رازی نەبت کو لێ دهێتە کرن... لەورا پشتی شەرێ جیهانی یێ دووێ، پێکولەکا باش بۆ چارەسەرکرنا کێشەیێن کێم نەتەوان کریە، کار ژی کریە، د چارچوڤێ دەولەتەکێ دا بناڤێ سەروەریا دەولەتێ ئەڤ کێشەیە پشت گوهـ نە ئێخستیە کو هەر چەندە هیشتا ئەشکەنجەدان و تەپەسەرکرن، هندەکا ب کێشەیەکا ناڤخۆیی ل ڤەلەمدایە. وان نەڤێت چ لایەنەك مایێ خۆ ل کارێ نە ئاسایی یا دەستهەلاتدارێن زال دەست بکەت. تەپەسەری یا وان کەمینەیان ژلایێ دەستهەلاتداران ڤە، ململانێکا خۆینا وی ئینا گۆرێ. هەر ئەوێ ژی وەکریە گرنگی ب مافێ چارەنڤیسێ گەلان بهێتەدان.

(١) دەولەتا نەتەوە: پشتی ژناڤ چوونا رژێما دەرەبەگایەتی یێ و شکەستنا دەسهەلاتا کەنیسێ، چەندەها دەولەت ل ئەورۆپا لسەر بنەماییێن نەتەوایەتی دروست بۆوینە، وەك: نەمسا ، ئیتالیا، فەرەنسا، ڤان جۆرە دەولەتان حەتا ئەڤرۆ درێژی هەیە.

مەرەم ژ مافێ چارەنڤیسی پەیداکرنا بیاڤەکێ ئازادی یا مللەتی یە بۆ پێکئینانا قەبارەکێ سیاسی و یاسایی و ئابۆری و کۆمەلاّیەتی و رەوشەنبیری و کلتۆری، ل چارچوڤێ دەولەتاکا سەربەخۆ، یان دناڤ دەولەتەکا دیارکری دابیت..

چەندین راگەهاندن ژڤی بیاڤی ڤە دەرکەفتینە ((ژوانان راگەهاندنا ویلسن، پشتی شەرێ جیهانێ یێ ئێکێ، ئەلمانیا ب مەرج خۆ بدەستڤەبەردا، ل (٥/ ١١ /١٩١٨)دا ویلسن پەیمان دا، ویلایەتێن ئێکگرتییێن ئەمریکا وهەڤپەیمانێن وێ ب پێشنیارێن ئەلمانیا ڕازی ببن.

ل گۆتارا چار بەشێن سەرەکییێن ولسنی ل سالاّ (١٩١٨) دبێژیت:-

((نابیت چ جۆرێن پشکداریەکێ هەبیت. و چ زیانەك ب ئەگەرێ سزادانێ ڤە هەبیت نابیت خەلکی ل رێ یا کونفرانسەکێ نیف دەولەتی ڤە ژ دەستهەلاتەکێ بدەنە دەستهەلاتەکا دی. دڤێت رێز ل حەزێن وان یێن نیشتمانی بهێتە گرتن، دڤێت مللەت رازیبن ب وان دەستهەلاتێن ب سەردا دهێنە سەپاندن. چونکی مافێ چارە نڤیسی زاراڤەکێ بێ رامان نینە)).

ڕاگەهاندنا ئەتلەسی ((ڕۆز فلت))ی سەرۆکێ ویلایەتێن ئێنکگرتین ئەمریکا و سەرۆك وەزیرێن بەریتانیا وینستۆن چەرچل، سالاّ (١٩٤١) بریارەکا هەڤپشك دەرئێخست کو تێدا ئەو پرەنسیپێن وان ئاشکرا کرین کو ئەڤ دو دەولەتە پشتی ژنابرنا رژێما نازی ل ئەلمانیا بۆ ب دەست ڤەئینانا جیهانەکا ئاشتی خۆاز بریار بۆو بهێنە ب جهئینان، ئەڤ پرەنسیپە ژی پێکهات بۆون ژ:

(١) ڕۆزفلت: (١٨٨٢ - ١٩٤٥ ) سەرۆکێ سێیێ و دووێ یێ ئەمریکا یە (١٩٣٣ - ١٩٤٥ ). ڕۆلەکێ گرنگ د جەنگێ جیهانیێ دووێ دا دیت.

١) چار ئازادیێن بنەرەتی: ئازادبۆون ژ برسێ، ژ ترسێ، ئازادیا بیرورا و دەربرینێ وئازادیا ئایینی.

٢) ب دەستڤەئینانا مافێ چارە نڤیس د گشت مەسەلێن سەرەکیدا.

٣) مافێ گشت گەلان بۆ هەلبژارتنا جۆرێ وێ حکومەتێ کو وان بۆ دارشتنا شێوێ ژیانا خۆ پێدڤی پێ هەیە.

٤) ئازادیا بازرگانی و پێکڤەکارکرنا ئابۆری دناڤبەرا سەرجەم نەتەواندا.

٥) ئاشتی و سلامەتی بۆ گشت دەولەتان.

٦) ئازادیا هاتن و چوونا پاپۆران دناڤ دەریان دا.

٧) دەست بەردان بکارئینانا چەکی د دامەزراندنا سیستەمێ تەناهیێ وسلامەتیا هەردەم وڕامالینا چەکی ژوان نەتەوان کو ئاشتیێ دئێخنە دمەترسیێدا. بۆ هەمان مەرەم (ویلسن) ی ژی ل جەنگێ ئێکیێ جیهانێ (١٤) خال ئێخستنە بەرچاڤ. بەلێ چ هێزێن سەربازی و یاسایی ل پشت نەبۆو بۆ بجهئینانا ڤان بریاران.

پشتی دامەزراندنا ڕێکخراوا نەتەوەییێن ئێکگرتی، ڤێ ڕێکخراوێ بۆ بدەستڤەئینانا چارەنڤێسان ڕەوایی دا خەباتا گەلان، بەلێ زلهێزێن دونیایێ هێجەتێن جورا و جۆر ئینان دا ئاستەنگان بێخنە د ڕێیا وەرگرتنا وان مافا و ژناڤبرن و نەهێلانا شۆرەشێن ئازادیخۆازدا.

بۆ چارەسەرکرنا کێشا گەلان وکێم نەتەوا ژی ڕێکخراو نەتەوەییێن ئێکگرتی چەندین بریار دەرئێخستن، وەکی بریارێن (١٨٠٣) یا کۆمەلا گشتی، کو ل (١٤/١٢/١٩٦٢) دەرکەفتی، یا تایبەت بوو مافێ وەلاتان بۆ مفا وەرگرتن ژ سامانێن خۆییێن سروشتی، بریارا (١٥١٤) یا کۆمەلا گشتی ل سالا (١٩٦٠) یا تایبەت ب سەربەخۆبوونا گەلان و وەلاتێن ل بن دەست کو ب بریارا (ژناڤبرنا ئیمپریالیزمێ) یا بەرنیاسە. تێدا مافێ چارەنڤیسێ گەلان ب جۆرەکی دیارکریە کو. ئازادانە بشێن پێگەهەکێ موکومێ سیاسی دروست بکەن و گەشەپێدانێ ب ئابۆورێ خۆ بدەن و مافێ کۆمەلایەتی و ڕەوشەنبیری دەستەبەر بکەن.

بریارا (٢٩٥٥) یا كۆمەلا گشتی ل سالا (١٩٧٢) یا تایبەت بۆ ب رەوادانا خەباتا چەكداری یا گەلان بۆ ب دەستڤەئینانا مافێ چارەنڤیس.

ئەڤان بریارا سیاسەتا داگیركرنێ ب هەمی شێوەیێن وێڤە قەدەغەكر وئێخستە دناڤ خانا تاوانێدا و رەوایی ژی دا خەباتێ بۆ ب دەستڤەئینانا مافێ چارەنڤیس:-

١- هەر گەلەكی مافێ دیاركرنا چارەنڤیسێ خۆ هەیە ول دیڤ وی مافی بۆ هەیە ب ئازادی بریارێ ل سەر قەبارێ سیاسیێ خۆ بدەت و ب ئازادانە درێژیێ ب پێشڤەچوونا ئابۆوری و كۆمەلایەتی و روشەنبیری بدەت.

٢- هەر گەلەك بۆ ب دەستڤەئینانا ئارمانجێن خۆییێن تایبەت، دشێت ب ئازادی رەفتارێ دگەل سامان و داهاتێ خۆییێ سروشتی بكەت، بێ كو ژ چ پێگریەكێ بهێتە لادان یا كو ژ هەڤكاریا ئابۆریێ دەولەتان پەیدادبیت ول سەر بنەمایێ مفاییێن هەڤپشك دامەزرایە و نابیت ب هیچ شێوەكی چ گەل ژ هۆیێن تایبەتییێن خۆ یێن ژیانی بێ بەهرببێت. ئەڤە دەقێ بەندێ ئێكێ یە یا بەلێنا نیڤ دەولەتی یا تایبەت ب مافێن مەدەنی و سیاسی، كو ب بریارەكا كۆمەلا گشتی، باوەری پێدایە. . . .

ل دویڤ ئەڤا سەری بۆ مە ئاشكەرا دبیت كۆ ب دەستڤەئینانا مافێ چارەنڤیس رەوایە و نابیت ب مەسەلەكا نافخۆیی دانن ود چارچوڤێ سەروەریا دەولەتەكێدا سەح كەتێ، بەلێ مەسەلەكا نیڤ دەولەتییە ول كونگرێ دەولەتێن بێ لایەن د سالا ١٩٦٤ز دا، كو ل قاهیرەیا پایتەختێ مسرێ گرێدابوو، دان پێدان ب رەواییا خەبات و تیكوشانا گەلێن بن دەست دا و نوینەرێن بزاڤێن وان ژی ب نوینەرێن گەلێن وان دانان. ول كونگرێ جەزائیرێ ل سالا (١٩٧٣)ز ژی دا ب هەمان شێوە ئەڤ كار دووبارە كریە. هەر د وێ سالێدا، كۆمەلا گشتی یا نەتەوەیێن ئێگرتی ب بریارا (٣٠١٣)ێ رەواییا بزاڤ و خەباتا گەلان راگەهاند كو دژی داگیركەران و دەسەلاتێن بیانییان و رژێمێن رەگەز پەرستی خەبات دكر.

## ڕاهێنان

- ئەرێ ئەو کونگرو بریارێن دەربارەی مافێ چارەنڤیس دەرکەفتین، ب کریارێ چ کاریگەریا خۆ هەبۆو؟
- ئەرێ چارەنڤیسێ گەلان د کیژ خانا مافێن مرۆڤیدا خۆ دبینتە ڤە؟
- ئەرێ جوداهی هەیە دناڤبەرا مافێن کێم نەتەوان و مافێن گەلان؟

## تەوەرێ دووێ

### مافێن ئابووری و رۆشنبیری و کۆمەلآیەتی:

ب وێ چەندێ دهێنە نیاسین کو بتنێ ب یاسایێ ناهێنە دەستەبەرکرن، بەلێ پێدڤی ب بارەکێ ئابۆوریێ گونجای هەنە دا ئەرکێ دەولەتێ و دام و دەزگەهێن وێ دەستەبەر بکەت وئێك ژخەسلەتێن وێ ژی ب تایبەتی مافێن ئابۆوری وکۆمەلآیەتی ئەون کۆ مافێ (پێدانێ یە) وئەو کۆمەلە مافن کو بشێوەکێ گشتی هەنە وراستەوخۆ ب ژیان و ژیارێ و پێشڤەچوونا مرۆڤی ڤە دگرێداینە ود ئاستێ جیهانێ ژی دا گرنگییەکا تایبەت پێدایە درێکا گرێدانا کونگرێن گەشەپێدانا مرۆڤی و گرێدانا پەیمان و رێکەفتنامان کو گرنگترین ژوان پەیمانا مافێن ئابۆوری و کۆمەلآیەتی و روشنبیری یە کو ل سالا (١٩٦٦)ز ژلایێ رێکخراوا نەتەوەیێن ئێکرتی پەسەندکریە کو دڤێت بۆ سەرجەم مرۆڤان بێ جوداهیا زمانی و، رەگەز، بنەجها نەتەوەیی، بیروباوەر، ئایین، دەستەبەربکەن یا کو ئارمانج ژێ خۆشگوزەرانیا گشتی یە دجڤاکێ دیموکراتی دا.

### گرنگترین ئەو ماف پێکهاتینە ژ:

١- دان پێدان ب مافێ کارکرنێ درێکا پەیداکرنا زەمینا کارکرنێ کۆ مرۆڤ ب خۆ ب ئازادانە هەلبژێریت، ئەرکێ دەولەتێ بەرهەڤکرنا بەرنامێ مەشق پێ کرنێ و ئاراستەکرن و دابینکرنا ئامراز و ئامیرێن تەکنیکی و پیشەیی و دارشتنا سیاسەتەکا گونجای کو گەشەپێدانا ئابووری و کۆمەلآیەتی و ڕەوشەنبیری لێ پەیدابیت.

٢- دابینکرنا مەرجێن دادپەروەریێ بۆ کاری وەك کریا گونجای، مەرجێ کارکرنێ بۆ پاراستنا گیان وساخلەمیێ، دەلیڤا کارکرنێ، بێهنڤەدان ددەمێ کاری دا.

٣- مافێ پێکهاتنێ و ئەندام بۆونێ ل سەندیکا و ۆێکخراوان ب شێوەکی، ببیتە پاڵدەرەکێ بهێز بۆ دەستەبەرکرن وپاراستنا بەرژەوەندیێن ئابۆوری وکۆمەلایەتی و ڕەوشەنبیری.

٤- پێدڤی یە پاراستن و هاریکاریکرنا خێزانێ بۆ وی پیڤەری بت کو یەکەیەکا کۆمەلایەتییە و بنیاتێ جڤاکی یە ژ هەمی لایان ڤە، ژوانا ئاستێ ژیارا گونجای، دابینکرنا خۆپاراستنان بۆ دایکێ، دابین کرنا خوارن و جلو بەرگان...هتد.

٥- دابینکرن وپاراستن وچاڤدێریا نوشداری، کێمکرنا ڕێژا مرنا کۆرپە یان (الجنین) باشکرنا بارێ ساخلەمیێ و خۆپاراستنا ژ نەخۆشیا، رێگرتن دبەلاڤبۆونا وان دا.

٦- مافێ تاکە کەسی بۆ پەروەردە و فێرکرنێ.

٧- مافێ تاکە کەسی بۆ پشکداریێ دژیانا روشنبیری و مفا وەرگرتن ژ پیشکەفتنێن زانستی و پاراستنا شاکارا (الروائع) ئەدەبی و زانستی و هونەری و داهێنانان و بەرژەوەندیێن مادی و مەعنەوی.

٨- ئازادییا مولکداری بۆ مرۆڤی و بکارئینانا وی ب شێوەکی وەسا کو ل یاساو دەستوراندا بهێتە دیارکرن.

ئەڤ مافێن ل خارێ چەند مافەکێن ئابۆری و کۆمەلایەتی و روشنبیری نە:

## ١- دابینکرنا کۆمەلایەتی و ژیانا گونجای:

دابینکرنا کۆمەلایەتی، هاریکاریەکا یان مووچەیەکی هەیڤانەیە، بۆ وان کەسان دهێتە دان، یێن کو ژبەر هەر ئەگەرەکێ بیت نەشێن کاربکەن و شیانێن پەیداکرنا ژیارێ بۆ خۆ ومال وزارۆکێن خۆنینە. ئاستێ باشێ ژیارێ ومافێ هەبۆونا دابینکرنا کۆمەلایەتی، و هەر ڕێکەفتنامەکا تایبەت ب مافێن ئابۆوری و روشنبیری و کۆمەلایەتی چارسەرنەکریە، بەلکی

بەندێ (٢٢) ێ یێ جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی ژی ل ڤی لایی ڤە دبێژیت:
هەر کەسەکێ ئەندام دناڤ جڤاکیدا مافێ دابینکرنا کۆمەلایەتی هەیە، کو درێکا داهاتێ میللەت و هاریکاریا نیڤ دەولەتی ول دیف یاسا و دەستووری، داهاتێ هەر دەولەتەکێ دڤێت مافێن ئابۆری و کۆمەلایەتی و پەروەردەیی یێن کو پێدڤی نە بۆ سەرفیرازیا وی و گەشەکرنا ئازادانە بۆ کەسایەتیا وی بێهنە دابین کرن! بەندێ (٢٥) یێ ڤێ جارنامێ دبێژیت: ١- هەر کەسەکی مافێ ژیانەکا گونجای هەیە کو تێرا پاراستنا ساخلەمیا وی و ژیارا وی و خێزانا وی بکەت ئەو ژی خوارن و جل و بەرگ و خانی و چاڤدێریا نوشداری و خزمەتێن کۆمەلایەتی یێن پێدڤیێن وی ژی ڤەدگرت. دیسان مافێ دابینکرنا ژیانێ هەیە ل دەمێ بێکاریێ و نەخۆشیێ و پەکەفتیێ وبێ ژن و بێ ژنیێ و پیراتیێ و ژدەستدانا ئامرازێن ژیانێ ژبەر بارودۆخەکێ دەرەکی کو ژدەرڤەی دەسەلاتا مرۆڤی یە. ٢- دایکان و زارۆکا مافێ هاریکاریێ د چاڤدێریەکا تایبەت دا هەیە و هەمی زارۆك ژی ئەگەر ب رێکا شەرعی یان نە شەرعی ژدایك ببن دڤێت هەمیا پاراستنا کۆمەلایەتی هەبت! ل دیف ئەو هەردو بەندێن سەری، پێدڤی یە هەر کەسەك ژبەر هەر ئەگەرەکێ شیانێن کاری نەبت ل رێیا دابین کرنا کۆمەلایەتی ڤە ژیانا وی ب رادەکێ وەسا بهێتە مسۆگەرکرن کو رێز گرتناوی نەهێتە کێمکرن.

دابینکرنا کۆمەلایەتی و ژیانەکا گونجای ئێك ژ مافێن ئابۆوری و کۆمەلایەتی نە، کو دبێژنێ بەرەبابا دووێ (النسل الثاني) یا مافێن مرۆڤی و ژ مافێن سەرەکی یێن مرۆڤی نە ولێ ناهێنە جوداکرن. ب زوری ب رامانا یاسایی پەیڤەکە ب مافێ جڤاکی د دادنن نەك تاکە کەسی. مافێن ئابۆوری و کۆمەلایەتی ل دیف سروشتی، رامانا وێ یا یاسایی پێگری بۆون، داخازکرن، ژ مافێن مەدەنی و سیاسی دئێنە جوداکرن ئەو ژی:

**ئێك:** کۆمەکا مافانە ئێکسەر ب ئەنجام ناگەهینن، بەلکی بەرە بەرە، چونکی ب جهئینانا تەمامیا وان پێدڤی ب ب کارهینانا داهاتەکێ زورێ بەردەست هەیە،

چ ئەو داهات یێ نافخۆیی یان دەولەتی بیت، ل دیف ڤێ ژی ب جهئینانا وێ پێدڤی ب پێنگاڤێن ئێك ل دویف ئێك هەیە.

**دوو:** مافێن ئابووری و کۆمەلایەتی پشکداریەکا باش وکاریگەر یا دەولەتی بۆ پێدڤی یە، خۆ ئەگەر بۆ ب دەستڤەئینانا مافێن مەدەنی و سیاسی ب زوری پێدڤی ب وێ بت، دەولەت چ تشتان ناکەت بۆ نموونە وەکی ئەشکەنجەدان ژبلی ژ هێلانا دەولەتێ ژ وێ چ تشتێن دی نەڤێت. بەلێ بۆ نموونە مافێن پەروەردێ و خواندنێ، پێدڤی ب پێکول و داهاتەکێ زۆر هەیە، کو گەلەك لسەر دەولەتێ گران دبیت هەتا ب جهبینن، بۆ ب کارئێخستن وب دەستڤەئینانا مافێن ئابۆوری و سیاسی ژی، دڤێت راستەوخۆ سەرمایەو داهاتەکێ تەمام بۆ بهێتە دابینکرن.

ل دویف ئەو هەردوو بەندێن سەرەکی یێن جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی پێدڤی یە دناڤ هەر وەلاتەکیدا ل دویف بارێ دارایی و چەوانیا ژیانا هەڤوەلاتیان، ژیانەکا گونجای بۆ هەمی هەڤوەلاتیێن خۆ بینتە گۆرێ. هەتا ئەگەر ئەوی هەڤوەلاتی شیانێن خزمەتێ ژی نەبیت. دشێن دەسەلاتدارێن وی وەلاتی ل دویف داهاتێ خۆ جۆرو رێژا وێ دابینکرێ دیاربکەت. چ ل رێیا داهاتێ سروشتیێن وی وەلاتی بیت یان وەرگرتنا باجێ یان هەر شیوەیەکێ دی کو ب پەسەند بزانیت.

## راهێنان

- مەرەم ژ دابینکرنا کۆمەلایەتی چییە؟
- بەرووبۆمێ وەلاتی بۆ کێیە؟
- چێدبت کەس ژوی بەربۆومی بهێتە بێ بەهرکرن؟
- مەرەم ژ ژیانا گونجای چییە؟
- دابینکرنا کۆمەلایەتی ژبلی دابینکرنا خوارنێ وجلوبەرگان چیێ دی دگەهینت؟
- دابینکرنا کۆمەلایەتی هەر بۆ پیرو پەکفتیانە یان خەلکێ دی ژی بخۆڤە دگرت؟
- ئەگەر ڤەگریت ئەو کی نە؟
- ئەرێ دابینکرنا کۆمەلایەتی و چاڤدێریا کۆمەلایەتی زارۆکێن نەشەرعی ب خۆڤە دگریت؟

## ٢- مافێ ژینگەها پاقژ (ژینگەها پاراستی):

ژینگەهـ، ئێکە ژ بنەمایێن سەرەکی یێن هەبوونێ و پێدڤی یە بۆ بەردەوامیا ژیانێ پارێزگاری لێ بهێتە کرن وب پاقژی راگرن. ژینگەهـ بۆ هەمیان وب مولکێ مرۆڤایەتیێ ددانن و پشکا هەر زیندەوەرەکی تێدایە. لەورا مافێ مەیە داخازا پاقژ راگرتنا وێ بکەین و نەهێلین ب شێوەکێ نەرێکوپێك بۆ بەرژەوەندیێن وان کارگەهـ و دەولەتان ب کاربهینن. ژینگەهـ گشت ژێدەرێن سروشتی ڤەدگریت. ئاڤ، هەوا، ئاخ، داروبار، زیندەوەر و هەمی وان تشتان ژی ڤەدگریت یێن کو ل سەر ئاخێ و بن ئاخێدا هەین". هەر ئێك ژوانا ژێدەرەکێ سەرەکی یێ ژیانێ یە و پیسبۆون وتێکدانا وان کارەکێ خراب بۆ مرۆڤایەتیێ لێ دکەڤیت... ڤەدیتنا ژێدەرێن وزە ((هەلما ئاڤێ، رەژیا بەری، باریت، کارەبا، نەفت، وئەتۆم و..... هتد)) و ب کارئینانا وان د بۆارێن جودا جودایێن پیشەسازیێدا وپاشی ژی ل دروستکرنا چەکی وگەلەك جاران ژی پێکولێن دەولەتێن زلهێزێن وی دەمی و نهو بۆ دەست بسەرداگرتنا وان دەڤەران یێن ئێك یان چەند ژێدەرێن وزێ تێدانە بۆویە ئەگەرێ بەرپابوونا شەروشۆرێن زۆر و دژوار وهەمی جورێن چەکی تێدا ب کاردئینن. بێگومان ئەڤەژی دبنە ئەگەرێ پیسبۆونا ژینگەهێ. ئەڤە ژبلی ب کارئینانەکا نارەوایا وان داروبارێن ب بەرو بێ بەرێن دەڤەرێن جورا و جۆر، کو نەك هەر جهێن وان خەملاندبوون، بەلکی هەڤسەنگیاوێ ژی د ناڤبەرا ئەوان گازاندا ئینایە گۆرێ کو هەر ئێك ب شێوەکی دخزمەتا ژینگەهێ دایە. مرۆڤ هەمی جۆرێن مفای ژداروباران دبینت، ژلایەکی ڤە مفای ژ بەرێ داروباری و ژلایەکێ دی ژی ڤە بۆ پاقژیا ژینگەهێ و ئاڤ و هەوایێ پاقژ وب کارهینانا ڤەدو تایێن وان د دەمێ پێدڤی دا. بەلێ ل دەمێ پەیدابۆونا شەران سامانێ وان ژلایێ لایەنێن شەرکەرڤە دهێنە سووتن. باشترین نموونا زیندی یا نێزیك ژی برین و پشت گوهاڤێتنا ئەو هەمی داروبارێن دەڤەرێن جودا جودایێن عیراقێ بۆو کو رژێما ئەوی دەمی یا عیراقێ ب هێجەتێن جورا و جۆر پرانیا وان برینە و ژناڤ برینە. ل ژێریا عیراقێ ب دەهان هزار دارخۆرمە برینە و ل کوردستانێ ژی هەروەسا، چوونە سەر باخ و چاڤدێریکرنا وان ژ خۆدانێن وان ڤەدەغەکرن. کو بڤێ ژی ژبلی زیانا مالی یا خۆدانێن وان، هەڤسەنگیا سروشتیا وێ ژینگەهێ ژی پیسبۆو.

ئەو ئەگەرێن گرنگێن کارتیکرنەکا زۆر لسەر پیسبوونا ژینگەهێ هەین پێکهاتینە ژ:

زۆربوونا مرۆڤ و پێشکەفتنا بازرگانیێ دناڤبەرا وەلاتاندا وەکریە هاتن و چون و گەریان بووینە کارەکێ رۆژانە وب ئەگەرێ بکارئینانا " ترومبێل ، شەمەندەفر ، پاپۆران و فرۆکان.... هتد"، کو هەر ئێك پشکا خۆیا وزێ بکاردئینن و ژینگەهێ پیس دکەت و ژ روویێ ساخلەمیێ ڤە زیانەکا زۆر ب گیانداران دگەهینیت کو مرۆڤ ئێك ژوانایە. د پرانیا وەلاتێن جیهانا پیشکەفتی دا، پیسبوونا ژینگەهێ بوویە کێشەیەکا مەزن، بزاڤێ دکەن دناڤ باژێراندا کێمتر ترومبێلێ بکاربینن، سالانە رۆژەکێ بۆ نەهاژوتنا ترومبێلێ تەرخان دکەن، باجا ترومبێلان زێدەدکەن، راوەستیانا ترومبێلان ل جهێن تایبەتێن واندا گران دکەن، هاندانا خەلکی دکەن کو هندی بشێن پایسکلان دناڤ باژێراندا بکاربینن، هاتن و چونا ترومبێلان د ناڤەندا باژێراندا قەدەغەبکەن.

رۆژانە، هەر خێزانەك خۆ ژبەرمایك و پیساتیێن مالا خۆ، خۆ رزگاردکەن. وەکی دزانن، باژێرڤانی وان بەرمایکان خرڤەدکەت ول جهەکێ دویری باژێری، یان دسۆژیت یان کوم دکەت و پاشی ئەو ژی دبیتە کێشەیەکا دی یا پیسکرنا ژینگەهێ.. ددەمێ سوتنێدا، دبیت گەلەك تشت دناڤدابن، سوتنا وان تشتێن خراب ژێ پەیدادبن وزیانەکا مەزن ب ساخلەمیێ دگەهینیت. لەورا هندەك وەلات، د پشکا پاقژیا ژینگەهێ یا باژێرڤانیا باژێراندا، بێ بەرامبەر سندۆقان بسەر خێزاناندا دابەش دکەن و رێنمایان ددەنێ، هەتا ئەو تشتێن ژ ئەنجامێ سوتاندنێدا جورە غازەکا ژهراوی و ترسناك ژێ دەردکەڤیت، بکەنە دوان سندۆقاندا و رۆژەکێ ژی بۆ کومکرنا وان دیاردکەن، هەتا بجورەکی ژناڤ ببەن و زیانی نەگەهینن، ئەو بەرمایکێن دی ژی کو دشێن جارەکا دی بکاربینن و مفایی ژێ وەربگرن جودا دکەن و دوبارە پشتی چێکرنا وان بکاردئینن، هندەك وەلاتێن لسەر دەریایا یان بەرمایکێن پیسێن خۆ دهاڤێنە ددەریایێ دا و ئەو ژی زیانەکا مەزن ب گیاندارێن دناڤ دەریایێ دا دگەهینن. کارگەهێن پیشەسازی، ژبلی وێ غازا د هەوایی دا بەلاڤەدکەن، ژناڤبرنا بەرمایکێن وان ژی، بۆیە گرفتەکا مەزن و پێدڤی یە کار بۆ بهێتە کرن.

هەبوونا کارگەهان نێزیك باژێر و باژێرك و گوندان، زیانەکا مەزن ب ئاکنجیێن دەڤەرێ دگەهینیت.

یا ژ ئەڤێن سەری هەمیان گرنگتر، ئەو کارگەهێن کو د بیاڤێ ئەتۆمی و کیمیا گەری و هندەك تشتێن ژ وان بابەتاندا کاردکەن، نهو بەرمایکێن ئەڤان کارگەهان بووینە کێشەیەکا مەزنا مرۆڤایەتیێ و چەندین رێکخراو و پارتێن پارێزەرێن کەسکاتیێ بۆ رێگرتن ژ هەبوونا وان جۆرە کارگەهان پەیدابوون. پارتا کەسك د پرانیا وەلاتێن ئەورۆپی دا هەنە وب توندی بەرامبەر وان کارگەهـ و حکومەتان دراوستن کو بەرمایکێن ترسناکێن کارگەهێن خۆ دئێخنە دبن ئەردی یان دهاڤێنە دەریایاندا.

لایێ مەژی، پشتی سەیرانی بەرمایکێن خۆ بێی کۆمکرن د جهێن گەشت و گۆزاری دا بجهـ دهێلن، جار هەیە ئەگەر ژبەر هەر ئەگەرەکی کرێکارێن گلێشی کوم دکەن ددەمێ خۆدا نەگەهن، پشکەك ژ ئاکنجیێن تاخان بێی گوهێ خۆ بدەنە کەسەکی گلێشێ خۆ دهاڤینە دکاڤلێ تاخێ خۆدا.

ژینگەهـ پارێزی وەکو مافەکێ مرۆڤی، دگەل پێشکەفتنا جڤاکی و پیشەسازی سەرێ خۆ هەلدایە، گرنگی یەکا زۆر هەیە، چونکی مەسەلەیەکە هەمی مرۆڤایەتیێ ڤەدگریت. نهو گرنگیەکا زور پێ دەن و هندی وێڤەترە خەلك زێدەتر پشتگریا وێ دکەن... ئەرێ تو بۆچی نابی یە ئێك ژوان پشتەڤانیکەران؟

## ڕاهێنان

- ژێدەرێن پیسکرنا ژینگەهێ چنە؟
- ئەرێ د جەنگێن جیهانێدا بکارهاتینە؟ ئەگەر بەرسڤاتە بەلێ یە، چنە وکێ بکارئینایە؟
- چەکێن کوم کوژ، پشتی بکارئینانا وان کارتێکرن لسەر بەرەبابێن پاشەرۆژێ دمینیت؟

## گرنگیێن پاراستنا مافێن مرۆڤی د نافخۆدا:

دەولەت وەکو پێکهات و خۆدان کەسایەتیەکا مەعنەوی دەستهەلاتەکا گشتی بسەر هەڤوەلاتیاندا پەیرەو دکەت، کو ب دەستهەلاتا گشتی دهێتە نیاسین، لدویف ئایدلوژی و هزر و رێبازێن سیاسی ب رێڤەدچیت، کو ئەڤە ژی ژ وەلاتەکی بۆ وەلاتەکێ دی دهێتە گوهۆرین ل ڤێرێ مافێ مرۆڤی دکەڤیتە بن کاریگەریا وێ گوهۆرینێ ب جورەکی کو د وەلاتەکێ دکتاتۆری و دەستهەلاتا ئێك کەسی دا مافێن مرۆڤی ب بەرفرەهترین شێوە دهێنە پێشێلکرن، بەلێ د وەلات و سیستەمێ سیاسیێ دیموکراسی و دبن دەولەتا یاسایێ دا مافێن مرۆڤی دچەسپن ئانکو لدەمێ پێشیلکاراياندا ئەنجامدەر روی ب روییێ بەرپرسیاریا یاسایێ دبن. ئەگەر دەستهەلاتا گشتی ژی دابەش بکەین ژ سێ دەستهەلاتێن سەرەکی پێکدهێن (یاسادانان، بجهئینان، دادوەری) هەر ئێك ژوانا راستەوخۆ یان نەراستەوخۆ ب بنەمایێن مافێ مرۆڤی ڤە دگرێدانە، ب وی پیڤەری مافێ مرۆڤی پەیوەندیێن موکم دگەل دەستهەلاتا یاسا دانانێ د (پەرلەمانی) دا هەیە، چونکی وێ دەستهەلاتێ شیانێن دەرێخستن یان باشکرن یان هەلوەشاندنا یاسایێ هەیە لەورا دشێت ب شێوەیەکی ژوان شێوان، یاسایا تێکەلی بنەمایێن مافی مرۆڤی بکەت. لەورا ل پرانیا پەیماننامە و رێکەفتنێن دبیاڤێ مافێ مرۆڤی دا، بەندەکێ تایبەت هەیە، بەحسێ چاکسازیێن یاسا و گونجاندنا وان دگەل بنەمایێن مافێ مرۆڤی دکەت، چونکی مافێ مرۆڤی و یاسا دویەکێن پێکڤە دگرێداینە.

هەر دوی چارچوڤەیی دا، پرانیا روی ب رویبوونا دناڤبەرا مافێ مرۆڤی ودەستهەلاتا جهبجهکرنێدا رەنگڤە دەتەڤە، وێ دەستهەلاتێ ب رێکا دام و دەزگەهێن جودا یاسا و دەستهەلاتێن گشتی بسەر هەڤوەلاتیاندا دسەپینیت، لەورا لبن نەبۆنا چەندین پیڤەرو چاڤدێریی، سنور دانان بۆ ئەڤێ دەستهەلاتێ ریخۆشکرنا پێشێلکاریێ بۆ مافێن مرۆڤی پەیدا دکەت، کو ئەو ژی د دو بیاڤێن سەرەکی دا پێکڤە گرێدەت (تاکە

کەس بەرامبەر تاکە کەس) و (دەستهەلاتا گشتی بەرامبەر تاکە کەسی)، ب وی پیڤەری کو بنەمایێن مافێ مرۆڤی د یاسایی بن، د دەمێ پێشێلکرنێدا ل هەر دوو بارودۆخاندا دڤێت دادگەهـ و دەستهەلاتا دادوەری ئەرکێ پاراستن و ڤەگەراندنا مافان ب ستویێ خۆڤە بگریت، لدەمێ تاکە کەسەك دەست درێژیێ بکەتە سەر مافێ تاکە کەسەکی دی، ژ یاسایێ دەردکەڤیت، ئەگەر دەستهەلاتا گشتی ژی مافێ مرۆڤی تاکە کەسی یان ب کوم پێشێل بکەت، زێدەتر دەستهەلاتا خۆ بکاردئینیت و ب هەمان شێوە ژ یاسایێ لادەت.

مافێن مرۆڤی، یاسایا پاراستنا دادوەریێ بۆ دابین دکەت، لەورا دڤێت دەستهەلاتا دادوەریێ یا سەربەخۆبیت و سەروەریا یاسایێ بپارێزیت و مافێ پەنابرنا بەر دادگەهێ بۆ هەمی مرۆڤان یا پاراستی بیت، بێ جوداهیکرن دناڤبەرا واندا، ئەڤجا ئەو جوداهیکرن ژبەر هەر ئەگەرەکی بیت، وەکی ل پەیماننناما مافێن مەدەنی و سیاسییێن ل سالا ١٩٦٦ داهاتی (هەمی مرۆڤ، بەرامبەری دادگەهێ وەك هەڤن و مافێ هەر کەسەکی یە لدەمێ کێشەیەك هەبیت، چ کێشا وی یا سزادانێ بیت یان مەدەنی، دڤێت کێشا وی ژ لایێ دادگەهەکا تایبەتمەندا سەربەخۆڤە و بشێوەیەکێ دادپەروەرانە ببینیت). دشێن مافێ مرۆڤی ب وان پیڤەرێن بنەرەتی بناسین کو مرۆڤ بێ هەبوونا وان ب سەرفەرازی ناژیت. مرۆڤایەتی بناغێ ئازادیێ و دادوەریێ و ئاشتیێ یە، رێزگرتنا مافێن مرۆڤی ژی ریخۆشکرنە بۆ پێشئێخستنا تەماما کەسایەتیا تاکە کەسی و کومێ.

رەهـ وریشالێن مافێ مرۆڤی، ژوێ خەباتا نەڤەقەتیایا مرۆڤایەتیێ ڤە هاتینە، کو دسەرانسەری جیهانێدا، بۆ ئازادیێ و وەك هەڤیێ کریە، ژوێ هەول و بزاڤا مرۆڤایەتیێ ژی ڤە کو ژ ژێدەرێن جۆراوجۆر و فەلسەفی و ئایینێن جودا بۆ ماینە. ئەو ماف ژی ل چەندین سۆز نامێن نیف دەولەتیێن مافێ مرۆڤی ڤە رێزکرینە، کو گرنگترین ژوان جار ناما جیهانی یا مافێ مرۆڤە یە.

پاراستنا مافێ مرۆڤی، ئێکە ژ گرنگترین بنەمایێن ئێمناهیا نافخۆ، ئەو ژی ب باوەریا تەمام ب بنەمایێن سەرەکی. ل هەر کیرێ بیت، مافێ مرۆڤی ب راستی یێ پاراستی بیت، ئەو جهـ دێ یێ ئێمن و بەرەف پێشکەفتنێ ڤە چیت. هەر کەس و رەفتارێن خۆ د ڤابەرەیەکێ دیارکریدا دزانیت و ژێ دەرناکەڤیت کەس ب ئەگەرێ (رەنگی، ئایین، نەتەوە، نفش، هزروبیر یان هەر تشتەکێ دی) جودا نەکەت و هەست ب کێم و کاسیا نەکەت و ب رێزگرتن تەماشەی مرۆڤێن دی بکەت، ئەو ژی پالدەرەکە بۆ بجێئینانا ئەرکێن مرۆڤایەتییێ دناڤ جڤاکی دا. ب بەروڤاژی، ل وان جهێن مافێن مرۆڤی تێدا پشتگوهـ هاڤێتی و ژبەر هەر ئەگەرەکی بیت جوداهی هەبیت، ئەڤە(نە ئێمناهی، ترس، رەڤ و تێکدان) دێ خەلکی ڤەگریت و هەردەم دێ بەرەڤ پاشکەفتن و کارساتان بەت و پێشێلا تەماما یاسایێ ژی دێ کەت. کەس رێزێ ل مافێ کەسێ دی ناگریت دجهێینانا ئەرکی ژی دا کێمتر خەمی دێ یا زالبیت. بڤێ ژی نە ئێمناهیەکا تەمام دێ پەیدابیت. ژمارەکا بەرچاڤ ژ دەولەتان د یاسا و دستورێن خۆدا گرنگی یەکا تەمام ب (٣٠) بەندێن جارناما جیهانی یا مافێن مرۆڤی دایە، کو پشتی جەنگێ دووێ یێ جیهانی، نەتەوەێن ئێکگرتی راگەهاندی یە، ئەو جەنگێ کو نێزیکی شێست ملیۆن کەسان تێدا گیانێ خۆ ژ دەستدای و پرانیا وەلاتێن ئەوروپا زیانەکا مەزن ڤێ کەفت وێرانکرن. هەر وان زیانێن زۆر ژی وەل ئەوروپا کر، ل ڤۆناغێن پشتی جەنگی ب شێوەیەکێ باشتر خۆ ب پاراستنا مافێن مرۆڤی ڤە گرێدەت و بپارێزیت.

ل ئەوروپا، ب تایبەتی ل ئەوروپا روژئاڤا، ب دەهان رێکخراو بۆ بەرەڤانیکرن ژ مافێن مرۆڤی هاتنە دامەزراندن وپرانیا ئاکنجییان لدویڤ دەنگێ بانگەوازیا وان چوون.

وان رێکخراوێن جیهانی جهێ دیارێ خۆو گرت و بەیاننامنا سالانە حسێبا تەمام بۆ دکر، هەر هەڤوەلاتیەکێ ژی پێشێلکاری دوێ بەیاننامێ دا هەبیت ئەڤە بۆ هندێ شێوازێ خۆ ژوی بارودوخی بگوهۆریت و تۆمارا مافێن مرۆڤی ب پاڤژی راگریت، گڤاشتنا تەمام دئێخستە سەر.

هەر دەولەتەك، شارستانی و پێشکەفتنا وێ بپاراستنا مافێ مرۆڤی ڤە گرێدایە، چەند مافێن هەڤوەلاتیێن خۆ راگریت هند یاسا د وەلاتێ واندا دێ سەروەر بیت وکێم کێشە بن، بەروڤاژی ژی راستە. چونکی پێشێلکرنا مافێ مرۆڤی، نە وەك هەڤیی و نە ئێمناهیێ و بێ باوەریێ پەیدا دکەت. پاراستنا مافێ مرۆڤی هۆیەکێ سەرەکی یە کو ب راستی مرۆڤ خۆ ب مرۆڤ بزانیت. جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی، کو تێکرایا هەر (٣٠) بەندێن وێ بەرەڤانیکرنە ژ مافێن تاکە کەسی، ئەگەرەکێ گرنگێ پێکڤە هەلگرتن و رێزگرتنە ژ بیرورا و بۆچون و پیرۆزیێن ئێك و دو، دویرکەفتنە ژ دوژمناتیێ و پێکدادانێ. هەر دەولەتەك ژی پرانیا بەندێن ڤان مافان بپارێزیت، دێ بیتە جهێ باوەریا هەڤوەلاتیێن خۆ و دەولەتێن دی و خۆ ل رێزێن پێشیا رێزلێگرتییان بینیت.

## ڕاهێنان

- دبیت وەلاتەك بانگەوازا پاراستنا مافێ مرۆڤی لێبدەت و بەلێ گرتن و ئەشکەنجەدان ب حەزا بەرپرسان بیت؟
- دبیت هەر پارتەکا سیاسی ب رێکا توند و تیژیێ دەستهەلاتێ بدەست خۆڤە بینیت و بانگەوازا پاراستنا مافێ مرۆڤی ژی لێبدەت؟
- سەپاندنا حزبایەتیێ ب زوری، چەوا دهەلسەنگینی؟ ژ وی رویی ڤە بەرسڤا خۆ روون بکە.
- دەستهەلاتدار، مافێ مرۆڤی ددەن یان ماف ژ بنەرەتدا هەنە؟
- دجڤاکی دا پێدڤی یە هەر کەسەکی فێری مافێن وی بکەن؟
- لدەمێ مافێ کەسەکی دهێتە پێشێلکرن دڤێت پەنایێ بۆ کیژ دەزگایی ببەت؟

# تەوەرێ ئێکێ

## گرنگی یا مافێ مرۆڤی د پەیوەندیێن نیڤدەولەتیدا:

دئەڤرۆدا، لژێر کێمبوونا دەستهەلاتا دکتاتۆری ڤەبوویا جڤاکان وبهێزبوونا (تەوژما) دیموکراسیێ و پێشکەفتنا تەکنولۆجیا و دەرکەفتنا چەندین رێکخراوێن نیڤدەولەتی تایبەت ب مافێ مرۆڤی ومرۆڤایەتیێ ڤە، وەکو رێکخراوا لێبۆرینا نیڤدەولەتی، رێکخراوا جاڤدێریکرنا مافێ مرۆڤی د دونیایێ دا، فەرەنسا ئازاد، خاچا سۆر و رێکخراوێن جڤاکێ مەدەنی ودامەزراندنا رێکخراوێن هەرێمی وبەرتەنگ بۆونا تێگەهێ سەروەریا دەولەتێ، مافێ مرۆڤی د ئاستێ نیڤدەولەتیدا رۆژانە د پێشکەفتن و گەشەکرنێدایە. مافێ مرۆڤی بوویە پیڤەرەکێ گرنگێ پەیوەندیێن نیڤدەولەتی. ئەو دەولەتێن جورەك ژ جۆران مافێ مرۆڤی تێدا دهێنە پێشێلکرن و رێکخراوێن نیڤدەولەتی و هەرێمی پێشێلکاریێن وان دئێخنە بەرچاڤ، داخازا باشکرنا رەوشا مافێ مرۆڤی ژێ دکەن. وەکی دبێژن جیهانا ئەڤرۆ یا بوویە گوندەك و کۆمەکا رێکخراوێن نیڤدەولەتی یێن وەسا دەرکەفتی نە، تەکنولۆجیایا پێشکەفتیا ئەڤرۆ بۆ شەرمزارکرنا وان دەولەتان بکار ئینایە کو گوهداریا مرۆڤی و مرۆڤایەتیێ ناکەن و کورسیك و دەستهەلاتا خۆ لسەر هەمی تشتان دانایە. نهو، ژلایەکێ ڤە ب رێکا گڤاشتنا رێکخراوێن نیڤدەولەتی و کۆمەڵ و رێکخراوێن سیاسیێن دەولەتان و جەماوەرێ وەلاتی، ژلایەکێ دی ژی ڤە ب زوی بسەر ئاڤکەفتن و ئاشکەرابوونا راستییێن ڤەشارتیێن وان، وان دەولەتان شەرمزار دکەن.

چەوساندنا گەلەکی، ژلایێ دەستهەلاتدارێن وێ دەولەتێڤە، ئەو ژی ب بکارئینانا توندو تیژیا زور، توندو تیژیەك کو رێزگرتن نەبوو بنەمایێن جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی و نەبۆ چ ژوان سۆزنامێن نیڤدەولەتی دگریت و بەرهنگارێن خۆ ب شێوەیەکێ زر نە مرۆڤانە ژناڤ دبەن، دبارودۆخەکێ وەسادا، پێدڤی یە پەنایێ بۆ جڤاکێ نیڤدەولەتی ببەن وئەو ژی ب رێکا ئەنجومەنێ ئاسایشا نیڤدەولەتی، بۆ راگرتنا وی جۆرێ زورداریێ، رەوایێ ب دەست تێوەردانا کاروبارێن ناڤخۆیا دەولەتان بدەت، ب تایبەتی دژی رژێمێن وان گەلان کو ب رێکەکا نەرەوا و سەربازی هاتبن و بوو سەپاندنا خۆ ژی زمانێ

ژئازار و ئەشکەنجەدان و تەپەسەرکرنێ چ دی نزانن... هەر وێ چەندێ ژی رێك ب نەتەوەێن یەکگرتی دا، د کوچرەوا (مەشەختبوونا) سالا ١٩٩١ یا گەلێ کورد بریارا ٦٨٨، بۆ پاراستنا مافێ مرۆڤی ل عێراقێ ب گشتی وکوردستانێ ب تایبەتی دەربێخیت، دەرکەفتنا ئەڤێ بریارێ بۆویە دەستپێکا دەستێوەردانا نەتەوەێن ئێکگرتی د کارو بارێن وان دەولەتان ئەوێن کو ب شێوەکێ بەرفرەهـ مافێ هەڤوەلاتیێن خۆ پێشێل دکرن. ئەڤەبوو دچارچووڤێ ئەڤان گوهۆرینادا نەتەوێن ئێکگرتی، ب مەرەما راگرتنا ڤان پێشێلکاریێن ل سومال و یوگسلافیا و کوسۆڤۆ رویدان. ل هەواروان بچیت.

گوهۆرینا پرەنسیپا دەستێوەرنەدانێ ل کاروبارێن دەولەتان کو د میساقێ نەتەوەێن ئێکگرتی دا چەسپاند بوو، بۆ دەستێوەردانێ ل دەمێ پێشیلکرنا مافێ مرۆڤی، ب دەستکەفتیەکێ گرنگێ خەباتێ یە ل بێخەمەت چەسپاندنا هەمی مافێن مرۆڤی، گرنگترین گوهۆرینن نیڤ دەولەتی دهێتە دانان، کو دبیتە رێگرەك ل بەردەم دەستهەلاتا بێ سنوریا رژێمن دیکتاتۆری، ئەڤ رژێمە بەراهیکێ ب ساناهی و ب هێجەتا دەستێوەر نەدانا د کاروبارێن ناوفخۆ یێن واندا، مافێن مرۆڤی ب شێوەکێ بەرفرەهـ پێشیل دکرن.

## ڕاهێنان

- ئایا نەتەوەێن ئێکگرتی دشێن رێ ل وان پێشیلکاریێن دژی ب مافێ مرۆڤی دهێتە کرن بگریت؟ چاوا؟
- ڕێکخراوێن مافێ مرۆڤی دشێن ب هێزێ، رێکێ ل پێشیلکاریان بگرن.
- گەلەك جاران مەگوهـ لێ دبیت کو ڕژێمەکا دیارکری پێگیر نابیت ب یاسایێن نیڤ دەولەتی پێدڤی یە سزا بدەت، هەتا رەوشا خۆ ژ وی لایڤە باش بکەت، ئەرێ تو دشێی لایەنەکێ ژ وی جۆری دەستنیشان بکەی؟
- گوهۆرینا پرەنسیپا دەستێورنەدانێ د کاروبارێن نافخۆدا بۆ دەستێوەردارنێ چەوا هەدلسەنگینی؟
- دەمەکێ زورە تورکیا پێکولا چوونا ناڤ ئێکەتیا ئەورۆپا دکەت، بەلێ هەتا نهۆ نەهاتیە وەرگرتن، گرنگترین ئەگەرێن وەرنەگرتنا وێ چنە؟

# تەوەرێ دووێ

## رێکخراوێن مافێ مرۆڤی:

ل وەلاتێن کاڤلکری ب ئاگرێ جەنگی هاتینە سوتن، چەندین رێکخراو ب مەرەما چاڤدێری کرنا مافێ مرۆڤی و نەهێلن کارەساتێن هەردوو جەنگێن جیهانی جارەکا دی دووبارە نەبنەڤە هاتنە دامەزراندن رێکخراوان ب شێوەکێ گشتی دکەنە دوو پشك:

**١- رێکخراوێن نیڤدەولەتی یێن نەحکومی:** ئەڤان رێکخراوان دەستێ هاریکاریێ بۆ هەمی جیهانێ هاڤێتینە. و د پرانیا دەولەتێن جیهانێ دا، چ ب ئاشکرا و چ ب نهێنی، نوینەرێن خۆ هەنە و لدویف هەمی جۆرێن پێشیلکاریەکێ دگەرن کو دبنە ئەگەرێ دەرکەفتن ژ بنەمایێن مافێ مرۆڤی خەلکەکێ زور ل دەوروبەرێن وان کوم بووینە. زێدەباری ڤێ کو سالانە، راپۆرتان سەبارەت ب پێشێلکاریێن مافێ مرۆڤی ئامادە و بەلاڤ دکەن. د هەمان دەم ژی دا بۆ ئاگەهدارکرنا خەلکی ل مافێن وان چەندین پەرتووك ونامیلکێن ب بها ل بیافێن جۆراجۆر راگەهاندن و چاپ و بەلاڤەکرن، ڤێ چەندێ ژی هشیاریێ دناف خەلکێ دا بەلاڤ بکەن راپورتێن وان ژی ل ئاستێ نیف دەولەتی دەنگ ڤەدانەکا باش هەیە. (رێکخراوا لێبۆرینا نیف دەولەتی - ئەمنستی ئینتەر- ناشینال) کو بارەگەهێ وێ یێ سەرەکی ل بریتانیایە، (رێکخراوا چاڤدێریا مافێ مرۆڤی- هیومان رایت وچ) کو بەشەکی وێ ژی بۆ چاڤدێریا پێشێلکاریێن دەڤەرا رۆژهەلاتا ناڤەراست هەیە ب ناڤێ (میدل ئیست وچ) و بارەگاییێ وی ژی ل ئەمریکایە. ( رێکخراوا فەرەنسا ئازاد -فرانس لیبەرتی) بارەگاییێ وێ ل فەرەنسایە.

**٢- رێکخراوێن نەحکومی یێن دەڤەری:** ئەڤ رێکخراوە زێدەتر دڤەرینە و چاڤدێریا وان پێشێلکاریان دکەن کو ل جهەکێ یان ددەولەتەکا دیارکری دا رووی دەن. هندەك ژ حکومەتێن پێشێلکار، ب مەرەما خاپاندنا جیهانێ رێکخراوێن ب ڤی جۆری د وەلاتێن خۆدا دادمەزرینن و کەسێن

دبنە بەرپرس، کو د ئاستێ پێشێلکارییێن حکوومەتێن خۆدا بێدەنگدبن، باشترین نموونەژی ل سەرڤان رێکخراوان رێکخراوا مافێ مرۆڤی یا عیراقی ل سەردەمی بەعسیان و هەڤکویفێن وێ بەلێ مەرج نینە هەمی رێکخراوێن حکومی و دەڤەری ژ وی جۆری بن، بەلکی هندەك ژوان رۆلەکێ باش یێ هەی ل هەردوو بیاڤێن ئاگەهدارکرن وهشیارکرنا خەلکی ل مافێن وان ودەستنیشانکرنا پێشیلکارییێن وان.

## ٣- رێکخراوێن نافخۆیی یێن نەحکومی:

ئەوان رێکخراوان ڤە دگریت د چارچوڤێ ئێك دەولەتدا، سەربخۆ ژ حکومەتێ کاری دکەن، پرانیا وان پەیوەندی دگەل رێکخراوێن نەحکومی یێن جیهانی و دەڤەری هەنە و هندەك جاران ژی د ئێك تۆرا کارکرنێ دا دبن.

کارێ رێکخراوێن نافخۆییێ ژلاییێ یاسایی ڤە دهێتە رێکخستن کو ب یاسایا کۆمەڵ و رێکخراوان دهێتە نیاسین، ئەڤ یاسایە ژ دەولەتەکێ بۆ دەولەتەکا دی جودایە، چەند دەولەت ژی یا دیموکراتی بیت هند ژی یاسایا وێ یا ڤەکریە و کارساناهی دبیت بۆ دروست کرن و کارکرنا رێکخراوان و بەروڤاژی چەند دەولەت یا دیکتاتۆری بیت هند یاسایا وێ دێ رێگربیت ل بەرامبەر کارێ رێکخراوان دا، هندەك جاران ژی هەر رێکێ نادەت بۆ دروست بۆونا وان بتنێ ئەو نەبن کو دروستکەرێ دەولەتێ ب خۆ بن.

رێکخراوێن نافخۆییێن نەحکومی رۆلەکێ مەزن هەیە ل پێشڤەبرنا جڤاکێ مەدەنی و چەسپاندنا پرەنسیپا مافی مرۆڤی و دیارکرنا ئەوان پێشێلکاریان یێن دەستهەلات ئەنجام دەت لەورا کۆمەلا گشتی یا نەتەوێن ئێکگرتی د بیرهاتنا پێنجی سالان یا جارناما جیهانی یا مافێن مرۆڤی دا بریارەك پەسەندکر تێدا داخاز ژ حکومەتێن دەولەتان کر کاری زێدەتر ساناهی بکەن بۆ کارێ رێکخراو و یاسایێن وان ب جۆرەکی دارێژن رێگرییێ دروست نەکەن ل بەرامبەر وان.

## ڕێکخراوا لێبۆرینا نیڤ دەولەتی - ئەمنستی ئینتەرناشنال

## Amnesty Inter natioual

بۆ پتر ڕوهنکرنا کارێ ڕێکخراوێن نیڤ دەولەتی، ڕێکخراوا لێبۆرینا نیڤ دەولەتی -ئەمنستی ئینتەر ناشنال - دێ کەینە نموونە، هەتا ل جۆرو ئەرك و چاوانیا کارێ ڕێکخراوێن نیڤ دەولەتی تێ بگەهین.



ئارمێ ڕێکخراوا ئەمنستی ئینتەرناشنال

ڕێکخراوا لێبۆرینا نیڤ دەولەتی - ئەمنستی ئینتەر ناشنال - رێکخراوەکا خۆ بەخشا جیهانیە بۆ وان کەسانە کو داخازا مافی مرۆڤی دکەن و کاری ژی بۆ پاراستنا وان مافان دکەن. ئەڤ ڕێکخراوە بزاڤەکە، ل سەر ئاستێ سەرجەم حکوومەت وبیروراییێن سیاسی و ئایینی یا سەربەخۆیە. پشتەڤانی و بەرهنگاری چ حکومەت و ڕژیمەکا سیاسی ناکەت، دیسان پشتەڤانی و بەرهەهنگاریا بیروباوەرێن وان قوربانیان ژی ناکەت کو پێکولا پاراستنا مافێن وان بۆ دکەت. ژبلی پاراستنەکا بێلایانە یا مافێ مرۆڤی، چ مەرەمەکا دی نینە، ئەڤ ڕێکخراوە کاری بۆ کوم کرنا خەلکێ چالاك و خۆبەخش دکەت، ئەو کەسێن بێبەرامبەر پشکەکێ ژ پێکول و دەمێ خۆ بۆ وی ئەرکی تەرخان دکەن. ئەڤێ ڕێکخراوێ ژی د هەمی جهێن جیهانێ دا، تۆرەکا جۆراوجۆر ژئەندام ولایەنگرێن خۆ هەیە. دوماهی

سەرژمێردا، نێزیکی ملیۆنەك و نیڤ ئەندام ولایەنگر و هەڤال دزێدەتر ژ (١٥٠) وەلاتاندا هەنە و ئەندامێن وێ هەلگرێن هەمی جۆرێن هزرا رەوشەنبیری و کۆمەلایەتی و جوداهیەکا مەزن ژی دناڤبەرا بیرو باوەرێن سیاسی و ئایینێ وان داهەیە، بەلێ کارێن وان دا بۆ چێکرنا جیهانەکێ کو تێدا هەمی کەسان مافێن وان یێن مرۆڤایەتی دپاراستی بن، هزرو بۆچوونێن وان وەکێ ئێکن. ئەڤێ رێکخراوێ د نێزیکی (١٠٠) وەلات و دەڤەراندا لقێن دانپێدای یێن خۆ ڤەکرینە، کو ب هزاران لاو و قوتابی و بسپۆر د بیاڤێ مافێ مرۆڤی دا کاری تێدا دکەن.

رێکخراو خۆ دبینیت د جیهانەکێ داکو خەلك ب هەمی مافێن مرۆڤی، ئەو مافێن ل جارناما جیهانی یامافێ مرۆڤی و پیڤەرێن دی یێن مافێ مرۆڤی یێن نیڤ دەولەتی داهاتین پێ خۆش ببن.

**تەوەرێ سەرەکی یێ خەباتا ڤێ رێکخراوێ دڤان خالێن خارێ دا خۆڤە دبینتەڤە:**

- خەباتکرن بۆ دانانا رادەکی بۆ کوشتنا سیاسی وکارەستێن بێ سەروشوینکرنێ.
- بەرهنگاریا سزایێ کوشتنێ (سێدارەدان و گوللەبارانکرن) و ئەشکەنجەدانێ و ئەو تشتێن دی دکەت کول خانا تەپەسەرکرنا توندوتیژیێ دهێتە دانان.
- خەبات بۆ دەستەسەرکرنا پێشێلکاریێن مافێ مرۆڤی وهنارتنا وان بۆ دادگەهان.
- پێکول بۆ ئازادکرنا زیندانییێن هزرو بیران، ئەو ژی ل دویڤ یاسایا بنەرەتی یێ رێکخراوێ، ئەو کەسن ب ئەگەرێ ((بۆچوونەکا سیاسی، ئایینی، یان هەر بۆچوونەکا دی کود وژدانا وان دا شینبوویە، یان زمان، یان رەسەنێ نەتەوەیی یان جڤاکی، یان بارێ ئابووری، یان ژدایکبۆون، یان هەر تشتەکێ دی بەلاڤ کرین و توندوتیژی بکارئینایە و داخاز بۆ بکارئینانێ نەکربیت.

- پێکول بۆ دادگەهکرنەکا ب لەز و دادپەروەرانا بۆ زیندانیان.
- بەرهنگاریا وان پێشێلکاریێن خراب کو بەرامبەر ب مافێن کەلتوری و جڤاکی و ئابووری دهێنە کرن.
- پێکول بۆ ڕازیکرنا کۆمپانیا و دەزگەهێن ئابۆوری هەتا پاراستنا مافێ مرۆڤی بکەن وب چاڤەکێ بلند تەماشەبکەن.
- بەرهنگاریا وان پێشێلکاریان دکەت، کو دەزگەهـ و کەسێن ژ یاسایا دەولەتێ دەردکەڤن کو دەولەت وەك پێدڤی ب ئەرکێ پاراستنا خەلکێ خۆ نەرابیت.
- هاریکاریا وان پەنابەران کو مەترسیە ب زڤەرنە وەلاتێن خۆ کو دویر نینە مافێن وان یێن بنەڕەت تێدا بهێنە پێشیلکرن.
- داخازێ ژحکومەتان دکەت ل دەمێ شەرێ چەکدارنە، کەسێ ب شێوەکێ نە یاسایێ نەکوژن.
- داخازێ ژ گرۆپێن چەکدار دکەت سنوورەکی بۆ پێشێلکاریێن خۆ دابنن وەکی گرتنا خەلکێ ل سەر هزروبیران، ترساندنا خەلکێ، ئەشکەنجەدان، کوشتنا نەیاسایی.
- خەبات کرن بۆ دانانا سنورەکی بۆ سەربازکرنا زارۆکان.
- هاریکاری کرن دگەل ڕێکخراوێن نەحکومی یێن دی، ونەتەوێن ئێگکرتی و ڕێکخراوێن حکومی و دەولەتی و دەڤەری، بۆ پیشتەڤانیا مافێن مرۆڤی.
- مسوگەرکرنا چاڤدێریا پەیوەندیێن سەربازی و ئاسایش و پۆلیسیێن نیڤ دەولەتی د پێخەمەت پاراستنا مافی مرۆڤی دا.
- ڕێکخستنا بەرنامەکی بۆ فێربوونا مافێن مرۆڤی وهشیاریا زێدەتر ل وی بیاڤی.

ئەڤ رێکخراوە و سەرجەم رێکخراوێن وەك وێ، فایلێن جودا جودا بۆ هەر دەولەتەکێ ژ دەولەتێن دونیایێ ڤەکرینە و لژنەکا سەربەخۆ سەرپەرشتیا هەر ئێك ژ وان فایلان دکەت و پرانیا بەرپرسێن فایلان نابن خەلکێ وان وەلاتان بن، هەتا بێلایەنی تێدا ب تەمامی بهێتە پاراستن.

## ڕاهێنان

- ئەو رێکخراوێن نیڤ دەولەتی ئەوێن دشێن دەستێ وان دپاراستنا مافێن مرۆڤی دا هەبیت کیشکن؟
- ئەرێ ڕێکخراوێن مافێ مرۆڤی چەکی ب کاردئینن بۆ رێگرتنان ل پێشێلکارییێن مافێ مرۆڤی؟
- ڕێکخراوێن حکومی و دەڤەری ب چ رێك دشێن خۆ بسەپینن و جهێ باوەریا هاڤوەلاتییێن وەلاتێ خۆبن؟
- چ ڕێکخراوەکا دی یا نیڤ دەولەتی تە گوهـ لێ بوویە ب کورتی بەحسێ وێ بۆ هەڤالێن خۆ یین خۆیندکار بکە.

# ژێـدەر

١- جارناما جیهانا یا مافێن مرۆڤی.

٢- اللجنة الدولية للصليب الاحمر/ الملحقات ((البروتوكولان))الاضافيان الى اتفاقيات جنيف المعقود في ١٢ أب / ١٩٤٩ / جنيف - ١٩٧٧ .

٣- حقوقنا مجموعة انشطة و تدريبات/ منظمة العفو الدولية المجموعات الفلسطينية.

٤- الشرعة الدولية لحقوق الانسان صادرة عن مركز حقوق الانسان في الامم المتحدة في جنيف مايس ١٩٤٥ ترجمة الى اللغة الكوردية من النص العربي المعتمد لدى الامم المتحدة. نشر في كوردستان في حزيران/ ٢٠٠٠ ألجهة المنفذة للمشروع: (American society For Kurds-ASK )
الجهة الممولة: ( The Natianal Endowment For Democracy - NED)
اسم المطبعة: مطبعة التربية - أربيل

٥- سەرتایەك بۆ تێگەیشتنی هەلبژاردن/ محەمەد خۆرشید توفیق - هەولێر ٢٠٠٣.

٦- ((دەنگی مروف)) گوڤارەکا وەرزیە یا رێکخراوا مافی مرۆڤی یە ل کوردستانێ ژمارە ٤ ی زڤستانا ٢٠٠٣ / ٢٠٠٤.

٧- للاجئين حقوق: منظمة العفو الدولية ((ئەمنستی ئینتەرناشنال)).

٨- دەستپێك بۆ: مافەکانی مرۆڤ لە کوردستان - عیراق د. صلاح محمد عزیز.